چیرۆکی منداڵان و مێرمنداڵان

# کۆخی زەبەلاح

رۆڵد داڵ

وەرگێڕ

نەسرین ئەحمەد

پێشکەشە بە
گوڵی باخەکەم تابان گیان
کە هەر لە ئێستاوە
حەز لە خوێندنەوە و نووسینی
چیرۆک دەکات




**خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوەی**

● **کۆخی زەبەلاح** (زنجیرەی چیرۆکی منداڵ و مێرمنداڵان)

● **رۆڵد داڵ**

● **وەرگێڕ: نەسرین ئەحمەد**

● نەخشەسازی ناوەوە و بەرگ: **رێدار جەعفەر**

● نرخ: (٣٠٠٠) دینار

● چاپی یەکەم ٢٠١٤

● تیراژ: (٧٥٠)دانە

● چاپخانە: **موکریانی (هەولێر)**

● **لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (٣٠٨) ساڵی(٢٠١٤)ی پێ دراوە.**

**زنجیرەی کتێب (٨٢٧)**





**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com

**ئیمەیل:** info@mukiryani.com

# ناوەڕۆك

## سەبارەت بە نووسەر

رۆلد داڵ نەرویجی بوو، بەڵام لە بەریتانیا لە دایك ببوو، هەر لە وێش خوێندنی تەواو کرد. لە تەمەنی هەژدە ساڵیدا بۆ کارکردن لەگەڵ کۆمپانیای نەوتی **شێل** چوو بۆ ئەفریقیا. لەگەڵ هەڵگیرسانی جەنگی دووهەمی جیهانی، وەك فرۆکەوانی جەنگی چوو بۆ ناو هێزی ئاسمانی بەریتانیا، لە لیبیا و یۆنان و سوریا خزمەتی کرد. دوای ماوەیەك لە واشینگتۆن بە پلەی جێگری پەیوەندیی کاری سیاسی، لە هێزی ئاسمانی دەست بەکار بوو، هەر لەو کاتەشەوە خەریکی نووسینی کورتە چیرۆك بوو کە ناوبانگێکی زۆری پێدەرکرد. رۆڵد داڵ بە شێوەیەکی کۆمیدی و جوان، لە کەش و هەوایەکی تێکەڵ لە خەیاڵ و راستی و وێچواندن، باسی پرسە پەروەردەیە کۆمەڵایەتییەکانی نەوەی نوێ دەکات. شێوەی نووسینەکانی نابراو زۆر دەوڵەمەند و شادی بەخشن. چیرۆکەکانی داڵ ئاوایەکی توندو هێرشبەر، هاوکات شیرین و سەرنج راکێشیان هەیە، وشە بە وشە خوێنەر بە دوای

خۆییاندا رادەکێشن. ناوبراو یەکێکە لە سەرکەوتووترین نووسەری کتێبی منداڵ و مێردمنداڵان، کە منداڵانی سەرتاسەری جیهان کتێبەکانی ئەویان خوێندۆتەوە و، زۆربەی خەڵاتە بەناو بانگەکانی جیهان بەو کتێبانە بەخشراون.

بەرهەمەکانی ناوبراو بریتین لە: **چارلی و کارخانەی چکولیات، جادووگەرەکان، ماتیلدا، سەفەری تەنیا، کۆخی زەبەلاح، دەرمانی ئەفسوناوی، خێزانی جەنابی گەمژە، رێوی سەر سوڕهێنەر، ساڵی من، چارلی و گەورە باڵابەری شوشەیی، دێنی پاڵەوانی جیهان، دێوەزمەی میهرەبان،** کوڕ. تێکڕای ئەو کتێبانە لە لایەن چاپخانەی(**نشر مرکز**) بڵاوکراونەتەوە.

چاپخانەی(نشر مرکز) چوار کۆمەڵە کۆورتە چیرۆکی بڵاوکردۆتەوە، کە بۆ تەمەنی گەورەترن، بە ناوەکانی: **ژنی خاوەن ماڵ، دوێنێ جوان بوو، خاتونی من کۆترەکەم و خزمەتکار.**

# یەك

جیمز **هێنری تراتر** تا تەمەنی چوار ساڵی ژیانێکی خۆشی هەبوو. لە خانوویەکی جوانی نزیك دەریا لەگەڵ دایك و باوکی بە ئارامی دەژیا. هەمیشە منداڵان لە دەورو بەری بوون، دەیتوانی گەمەیان لەگەڵ بکات. کەناراوێکی لمی لێ بوو کە دەیتوانی بە ملاولادا ڕا بکا و زەریایەك کە لە ناویدا گەمە بکات. ئەمەش ئارەزووی کوڕێکی بچکۆلانەیە. دواتر، ڕۆژێك، دایك و باوکی جیمز بۆ شت کڕین چوون بۆ لەندن و لەوێ تووشی ڕووداوێکی دڵتەزێن بوون. باوڕ دەکەن: کەرگەدەنێکی تووڕە و زۆر گەورە، کە لە باغی ئاژەڵانی لەندن ڕای کردبوو،( بە ڕۆژی ڕووناك و لە شەقامێکی قەڵەباڵغدا)، هەردووکیانی خوارد!

هەر وەك گومان دەکرێ، ئەو ڕووداوە بۆ دایك و باوکێکی ئاوا میهرەبان، ترسناك بوو. لە ڕاستیدا بۆ جیمز زۆر بە ئازارتر بوو. تێکڕای ناخۆشی و مەینەتییەکانی ئەو دووانە لە چاو تروکانێکدا کۆتاییان هات. مردن و دوای سی و پێنج چرکە، هەستیان لێبڕا. لەکاتێکدا جیمزی بێ چارە هێشتا زیندوو بوو، کتوپڕ خۆی لە جیهانێکی بێ سەرەو بەرە و بێ بەزەیی، تاك و تەنیا و ترس لەڵدا، دۆزییەوە. ئەو خانووە خۆش و جوانکیلەی نزیك دەریا،

بە ناچاری یەکسەر فرۆشرا و کوڕەشیان بەخۆی و جانتایەکەوە، کە جگە لە بیجامەە و فلچەیەکی ددان هیچ شتێکی تری تێدا نەبوو، نارد تا لەگەڵ دوو پورەکانیدا بژی.

پوورەکانی ناویان، ئیسپانج[1] و ئیسپایکر[2] بوو. بە داخەوە دەڵێم: هەردووکیان زۆر خراپ، خۆپەرست و تەمبەڵ و بێ بەزەیی بوون. هەر لە سەرەتاوە بێ هیچ هۆیەك دەستیان کرد بە لێدانی جیمزی بەدبەخت. هەرگیز جیمزیان بە ناوی خۆیەوە بانگ نەدەکرد، هەمیشە بە: **دەعبا و قێزەون** یا **بەڵای لابەلا**، یا **بوونەوەری بەدبەخت**، بانگیان دەکرد، نە ئامرازێکی منداڵانەیان پێدەبەخشی گەمەی پێی بکات و نە کتێبێك تا لە وێنەکانی بڕوانێ. ژوورەکەی وەك ژووری زیندانی ئینفیرادی بەتاڵ بوو.

پورە ئیسپانج، و پورە ئیسپایکر و ئێستاش جیمز، لە خانووێکی وێران و سەیرو سەمەرە، لەسەر گردێك لە باشوری بەریتانیا دەژیان. گردەکە ئەوەندە بەرز بوو کە جیمز لە هەموو شوێنێکی باغەکەوە دەیتوانی سەیری خوارەوە بکات و، لە دووری چەند کیلۆمەترەوە دیمەنی جوانی دارستان و مەزراکان. ئەو ڕۆژانەی ئاسمان ساماڵ با، ئەگەر بە ئاراستەیەکی دروست بیڕوانیبا، دەیتوانی خاڵێکی خۆڵەمێشی لە ئاسۆیەکی دوور دا ببینێ، ئەویش هەمان

---

١- Sponge بە واتای ئیسفنج

٢- spiker بە واتای دڕکاوی

خانوو بوو کە پێشتر جیمز لەگەڵ دایك و باوکی ئازیزیدا تێدا دەژیان. دروست لە پشتیەوە، جیمز دەیتوانی زەریاش ببینێ، رایەڵکەیەکی نیلی دوورو درێژ وەك هێڵێك، لە ژێر هێڵی ئاسماندا دەبینرا.

بەڵام جیمز هەرگیز رێی پێنەدرا لە گردەکە بچێتە خوار. پورە ئیسپانج و پورە ئیسپایکریش هیچ کامێکیان خۆیان بە جیمزەوە ماندوو نەدەکرد تا بۆ هیچ شوێنێك بیبەن، تەنانەت بۆ پیاسە کردن و سەیرانیش نەدەرۆیشتنە دەرەوە و، جیمزیش نەیدەتوانی بە تەنیا بڕوات. پورە ئیسپایکر وتبووی ئەگەر ئەو دەعبایە یا ئەو قێزەونە لە باغەکە بڕواتە دەرەوە، سزا دەدرێت. تەنانەت ئەگەر بوێرابا بە مەحەجەرەکەدا سەربکەوێ، سزای زۆر ترسناك، وەك زیندانی کردن لە ژێر زەمینی پڕ لە مشك، بۆ ماوەی هەفتەیەك چاوەڕانی بوو.

باغەکە هەموو گردەکەی داپۆشیبوو، بەربڵاو و چۆڵ بوو، جگە لە کۆمەڵێك گژو گیای بۆن ناخۆش و پیس کە لێرو لە وێ روا بوون، تەنیا درەختێك، و پیرە درەختێکی کۆخ کە هەرگیز کۆخی نەگرتبوو، باغەکە



شتێکی تری تێدا نەبوو، نە جۆلانەی لیّ بوو، نە هێلاّنەجوقە، نە سندوقێك بۆ تێکردنی چەوو لم و نە هیچ منداڵێکی تر کە بێتە ئەویّ و گەمە لەگەلّ جیمزی داماودا بکات. تەنانەت سەگ و پشیلەش ئەوەندە لە دەوروبەر نەبوون تا جیمز لەو تەنیایە رزگار بکەن. تا دەهات، جیمز غەمگین و غەمگین ترو تەنیا و تەنیاتر دەبوو، هەر رۆژەی چەندان کاتژمێرێك لە ناو باغەکەدا رادەوەستاو بە تاسەوە چاوی دەبرِیە دارستان و مەزراو و زەریا کە وەك قالیچەی جادویی لە ژێر قاچەکانی دا راخرابوو.

## دوو

دوای ئەوەی جیمزهێنری تراتر سێ ساڵی تەواو لەگەڵ پورەکانی دا ژیا، بەیانییەکی زوو شتێکی تارادەیەك سەیری بۆ هاتە پێش کە بەڕای من تارادەیەك ، بوو بە هۆی ڕوودانی ڕووداوی دووەم کە زۆر سەیر بوو و دواتر ئەو ڕووداوە سەیرە بوو بە هۆی ڕوودانی شتێکی تر کە بەراستی لە موعجیزە دەچوو.

تێکڕای ئەوانە لە ڕۆژێکی زۆر گەرمی ناوەراستی هاوین دەستی پێکرد. پورە ئیسپانح و پورە ئیسپایکر و جیمز لە ناو باغەکە بوون. وەك هەمیشە جیمزیان ناچار دەکرد کار بکات. ئەمجارەیان ناچار بوو بۆ ئاگری چێشتخانە دار بشکێنێ. پورەکانی بە خەیاڵێکی ئاسوودەوە لەسەر کورسیەکانیان لە نزیك جیمز دانیشتبوون و شەربەتی لیمۆیان لە پەرداخی گەورە کردبوو تامیان دەکرد وچاودێری جیمز بوون نەکو بۆ چرکەیەکیش دەست لە کار کردن هەڵبگرێت.

پورە ئیسپانج لە ڕادەبەدەر قەڵەو و خڕکەڵە بوو. چاوەکانی وەك چاوی تولە سەگی دەریایی بچووك بوون، لیچ و لێوێکی تێك قوپاوی هەبوو، و دەم و چاویشی شلوپل و سپی بوو، دروست وەك ئەوەی ئاوە کوڵیان کردبێ. لە

کەلەمێکی ئاوداری سپی و زەبەلاح دەچوو کە زۆر کولابێت. پورە ئیسپایگر، بە پێچەوانەوە درێژ و لاوازو رەقەڵە بوو، چاویلکەیەکی بێ دەسکی دەور فلزی لەچاو دەکرد کە بە گیرەیەکەوە لەسەر لوتی رادەوەستا. دەنگێکی بە جیکە جیکی هەبوو و لێوەکانیشی باریك و درێژ و تەڕ بوون. هەر کات تورە و یا خۆشحاڵ دەبوو و دەیوەیست قسە بکات، تفی لە دەمییەوە دەپرژا. هەردووکیان دوو زۆرزان و ترسناك لەوێ دانیشتبوون، کە خواردنەوەکانیان تام دەکرد جاروبار بەسەر جیمزدا دەیانقیژاند کە دارەکان توندتر و خێراتر بشکێنێ، بەردەوام بە خۆیاندا هەڵدەگوت، هەر یەکە باسی خۆی دەکرد کە بەڕای خۆی چەند جوانە. پورە ئیسپانج ئاوێنەیەکی دەسك درێژی لەسەر قاچی دانابوو. زوو زوو هەڵیدەگرت و لە دەم چاوە ناشیرنەکەی خۆی ڕادەماو دەیوت:

شێوە و بۆنەکەم وەك گوڵی سوورە
تۆ تەنیا سەیرکی دەم وچاوم کە
لوتم جوان و پرچم ئاوریشمە
ناسك و جوانە زۆرم خۆشدەوێ
گەر گۆریەکانم تەواو داکەنم
لەبەر پاو پوزم چاوت زەق دەبێ

پورە ئیسپایکر هاواری کرد:
لە یادەت نەچێ
ئەو ورگە زلت چۆن دەردەکەوێ

پورە ئیسپانج سوور هەڵگەڕا. پورە ئیسپایکر وتی:
دەبێ ئەوە بزانی
لە کێبڕکێ جوانیدا
پورە ئیسپایکر تاکە، جوان و خوێن شیرین
ددانە ڕێك و جوانەکەم ببینە، نەڵێی نامەوێ
ئەگەر بە جوانی سەیرم بکەی
دەمی کراوەو سەرنج ڕاکێشم ببینی
دەزانی چەندە ئێسك سوك و جوانم
چاوەکانم لەبەر جوانی دەدرەوشێنەوە
هەرکەسێك بم بینێ ئیتر واز ناهێنێ
بەڵام دەبێ بەڵێن بدەی
هەرگیز زیبکەی سەر چەناگەمت
نەتبینیوە

پورە ئیسپانج هاواری کرد:
تۆ دەزانی وەك پیرە ماسی هەر ئێسك و پێستی؟

پورە ئیسپانج دەریبڕی:
بەو جوانییەی کەمن هەمە
سەر لە هالیوود دەردێنم
تو گیانی من، مەگەر وانییە
کە هەموو دڵەکان بە تەنیا داگیر دەکەم
تەواوی دەرهێنەرەکانی هالیوود
هەموو رۆڵی سەرەکیەکان بدەن بە پورە ئیسپانجی ئازیز
لە دوای ئەوە هەموو ئەستێرەکانی سینەما
هەر کە منیان دیت
دەکشێنەوە و بە زەوی دا رۆدەچن

پورە ئیسپایکر وتی: ئەگەر وا بێ، رەنگە بتوانێ بە باشی رۆڵی فرانکشتاین[٣] بگێڕی.

٣- فرانگشتاین بوونەوەرێکی ترسناکی ئەفسانەیە، ئەو مردووەی شەوانە زیندوو دەبێتەوە و خەڵکی دەکوشت.

جیمزی داماو هێشتاش هەر خەریکی بێگاری بوو و داری دەشکاند. گەرمایەکە زۆر بە هێز بوو. ئارەقەی کردبوو هەموو گیانی وەسەر ئاو گەڕابوو. دەستەکانی ژانیان دەکرد. تەورەکە گەورە و زۆر لەوەی قورستر بوو مێرمنداڵێك بتوانێ داری پێبشکێنێ. جیمز لەپاڵ کارکردنەکەی، دەستی کرد بە بیرکردنەوە لەبارەی هەموو منداڵان، کە ئێستا ئەوان خەریکی چ کارێکن. لەوانەیە هەندێکیان لە حەوشەی ماڵەکانیاندا سواری پاسکیل بن، هەندێکیان لە ناو دارستانی فێنك پیاسە دەکەن و گوڵی کێویی هەڵدەکەنن و دەیانکەنە دەسك و تەواوی دۆستە بچکۆلەکانی پێشتر دەیناسین، ڕەنگە چووبن بۆ دەریاو لە ناو لمی شێدار و یا لە ناو ئاودا یاری دەکەن...

دڵۆپێکی گەورەی فرمێسگ لە چاوەکانی جیمز هاتە خوارێ، بەسەر کولمەکانی دا شۆڕبۆوە. دەستی لە کار هەڵگرت و پاڵیدا بە کۆلکی دار شکاندنەکەوە، لەبەر خەمی خۆی هەستی بە لاوازی کرد. پورە ئێسپایکر لە سەرەوەی عەینکە دەور فلزیەکەیەوە تێیڕاما بوو و بە هات و هاوارەوە وتی: چیت بەسەر هاتووە؟ جیمز دەستی کرد بە گریان.

پورە ئیسپانج فەرمانی دەرکرد: "زوو تەواوی بکە و خەریکی کارەکەت بە، بوونەوەری بچووك و قێزەون"!

جیمز بە دەنگێکی بەرزەوە وتی: ئاخ پورە ئیسپانج! تکا دەکەم، وەرن هەر سێکمان تەنیا بۆ جارێك بە پاس بڕۆینە خوارەوە بۆ قەراغی دەریا. زۆر دوور نییە. من زۆر هەست بە گەرما و بێ بەختی و تەنیایی دەکەم...

پورە ئیسپایکر هاواری کرد: " چی؟ بوونەوەری تەمبەل، تۆ بە کەڵکی هیچ کارێك نایەی!"



پورە ئیسپانج قیژاندی: لێیدە!

پورە ئیسپایکر بە دەنگێکی گڕەوە وتی: بە دڵنیاییەوە لێی دەدەم. ئەو لە جیمزەوە ڕاماو جیمزیش بە چاوە گەورەو ترساوەکانیەوە سەیری کرد. پورە ئیسپایکر وتی: دواتر رۆژێك کە گەرما نەبوو، لێی دەدەم. ئێستا لاچۆ لەبەر چاوانم، کرمە بچووك و قێزەوون! بڕۆ وازم لیّ بێنە.

جیمز رووی وەرگێڕاو ڕای کرد. تا ئەو جێیەی دەیتوانی بە خێرایی ڕای کرد تا گەیشتە دوورترین شوێنی باغ و خۆی لە پشت کۆمەڵە گژو گیای پیس ئەوناوە کە پێشتر باسمان کرد، خۆی حەشاردا. دواتر دەمو چاوی داپۆشی و گریاو گریا.

## سێ

هەر لێرە یەکەم ڕووداوی تارادەیەك سەیر کە بوو بە هۆی ڕووداوی زۆر سەیرو سەمەرەتر، بۆ جیمز هاتە پێش. جیمز لە ناکاو لە پشت سەریەوە دەنگی خشە خشی گەڵایەکانی بیست، کە ئاوڕی دایەوە پیاوێکی پیری بینی چاکەت و پانیۆڵێکی سەوزی تۆخی لەبەر، لە ناوگژ و گیایەکە هاتە دەرەوە. پیاوێکی پیری زۆر بچووك، بەڵام سەرێکی گەورەو تاس، سمێڵ فش و ریشێکی رەش و

توکاوی هەبوو. کاتێك گەیشتە یەك دوو مەتر نزیك جیمز، وەستا. راوەستاو پاڵی وە گۆچانەکەی دا، بە نیگایەکی جیدی لە جیمزەوە ڕاما.

کاتێك پیاوە پیرەکە قسەی کرد، دەنگی ئارام و گڕ بوو. بە پەنجەی دەست ئیشارەتی بۆ جیمز کرد و وتی: لێم نزیك بەوە، کوڕە. وەرە تا شتێکی لە رادەبەدەر گرنگت نیشان بدەم.

جیمز ئەوندە ترسابوو نەیدەتوانی بجولێتەوە.

پیاوە پیرەکە بە زەحمەت یەك دوو هەنگاو رۆیشتە پێشەوە، دواتر دەستی لە باخەڵی چاکەتەکەی ڕاکرد و پاکەتێکی سپی و بچووکی دەرهێنا. لەو کاتەی کە پاکەتەکەی بە ئارامی لە بەر دەمی جیمزی دێنا و دەبرد، بە هێواشی وتی: دەبینی؟ ئازیزم، دەزانی ئەوە چییە؟ دەزانی ئەو پاکەتە بچووکە چی تێدایە؟

دواتر دیسان هاتە پێشەوەو خۆی دولا هێنایەوە سەری بردە نزیك سەری جیمز، بە جۆرێك کە بای هەناسەکانی بەر رومەتی جیمز دەکەوت،. هەناسەکەی بۆنی ناخۆشی لێ دەهات وەك ئەوەی کەمێك بۆگەن بووبن و برشیان هێنابێ، وەکو بۆخنکی ناو ژێر زەمینێکی کۆن.

کابرا سەری پاکەتەکەی خوار کردەوە بۆ لای جیمز و وتی: ئازیزم، سەیرکە. جیمز لە ناو پاکەتەکەدا کۆمەڵێك شتی سەوزو وردی بینی کە وەك بەردی روون و بچووك و هەر یەکێکیان بە قەدەر دەنکە برنجێك دەبوو. جوان

و لە رادەبەدەر و نائاسایی بوون، دەدرەوشانەوە، هێزێکی درەوشانەوەی ئەوتۆ کە سەیرترین شێوەی درەوشانەوە بوو.

پیاوە پیرەکە بە هێواشی وتی: گوێیان لێبگرە! گوێ لە جوڵەیان بگرە!



جیمز لە پاکەتەکەیەوە ڕاماو دڵنیا بوو لەوەی کە دەنگی خشە خشێکی لاواز لە ناو پاکەتەکەوە دێ و دواتر کە لێی وردبۆوە، دیتی هەزاران دەنکی

سەوزو بچووك، هێواش هێواش دەسوڕێن، و بەسەر یەکتر دەڕۆن، وەك ئەوی زیندوو بن.

پیاوە پیرەکە بە ئارامی وتی: ئەو هێز و جادوەی کە لەناو ئەمانە دایە، پترە لە کۆی هێزی هەموو جیهان.

جیمز کە دەنگی دەرنەدەهات، بە ئارامی وتی: بەڵام، بەڵام ئەوانە چین؟ لە کوێوە هاتوون

پیاوە پیرەکە بە هێواشی وتی: "ئە ـ ها، هەرگیز ناتوانی بزانی لە کوێوە هاتوون!"ئەو ئێستا کەمێکی تر دولا هاتەوە و دەموچاوی لە جیمز نزیك و نزیکتر کردەوە، تا سەری لوتە درێژەکەی بەر نێوچاوانی جیمز کەوت. دواتر لە ناکاو کشایەوە پشتەوەو وەك شێتان گۆچانەکەی لە هەوادا سوڕاند. هاواری کرد:"زمانی چەند تیمساح! هەزار زمانی ئەستورو درێژی تیمساح لەگەڵ کەللە سەری جادوگەرێکی مردوو دوازدە شەوو رۆژ لەگەڵ هێلکەی چاوی مارمێلکەیەکدا کوڵاوە! دواتر پەنجەکانی بەچکە مەیمونێك، گواندێنی بەرازێك، دەنوکی توتیەکی سەوز، مەعجونی ژیشك و سێ کەوچکی پڕ شەکری بەسەر داکراوەو بۆ ماوەی یەك هەفتەی تر کوڵاوە و کارەکانی تری مانگ ئەنجامی داوە!

لەناکاو پاکەتە سپیەکەی لە ناو دەستی جیمز هاویشت و وتی: هانێ! بۆتۆ! ئەوە هی تۆیە!

# چوار

جیمز هێنری تراتر ل راوەستابوو، لە کاتێکدا پاکەتەکەی قایم لە ناودەستی گرتبوو چاوی لە پیاوە پیرەکەوە بڕیبوو.

پیاوە پیرەکە وتی: ئێستا، تەنیا دەبێ ئەو کارە بکەی: دۆلکەیەکی گەورەی ئاو هەڵبگرە، دەنکە سەوزەکانی تێکە. دواتر زۆر بە ئارامی یەك یەك دە تاڵە مووی سەرتی پێوە زیاد بکە. ئەو کارە چالاکیان دەکات دەبێتە هۆی ئەوەی وەرێکەون! لە ماوەی چەند چرکەیەك، ئاوەکە دەست دەکات بە کەف کردن و بە خێرایی قوڵپ دەدا. هەر کە ئەوە رووی دا، دەبێ بە خێرایی بیخۆیەوە، هەموو دۆلکە ئاوەکە بە جارێك بخۆرەوە. دواتر ئازیزم، هەست دەکەی ناو سکت دەکوڵێ و قوڵپان دەداو هاڵاوێك لە دەمتەوە دێتە دەرێ و یەکسەر دوای ئەوە، رووداو و شتی وات بۆ دێتە پێش کە لە موعجیزە دەچێ، شتی سەیر و دوور لە راستی، تۆ ئیتر لە ژیانتدا بێ بەخت و داماو نابی، مەگەر نا؟ پێویست ناکات پێم بڵێی! بۆ خۆم هەموو شتێك دەزانم! ئێستاش برۆ و چیم پێی وتی هەمووی بە باشی ئەنجام بدە و یەك وشەش سەبارەت بەو مەسەلەیە بەو دوو پورە ترسناکەکەت مەڵێ! تەنانەت یەك وشەش! هەروەها مەهێڵە دەنکە سەوزەکانی ناو پاکەتەکەت لێ دوور

بکەونەوە! چۆنکە ئەگەر ڕابکەن، جادوەکەیان لە جێاتی تۆ، کاریگەری لەسەر کەسێکی تر دەبێ! ئەوەش لەگەڵ حەز و ئارەزووی تۆ نییە، ڕاستە، ئازیزم؟ ***کە بە یەکەم کەس گەیشتن، جا چ بەلایەك بێ، چ مێش و مەگەز، چ ئاژەڵ یا درەخت، تەواوی هێزی جادویی ئەوان، بۆ ئەو دەگوازرێتەوە!***

ئەگەر وایە بە باشی ئاگاداری پاکەتەکە بکە! مەی دڕێنە! ڕاکە! زووکە! خێراکە! ئێستا کاتی خۆیەتی! خێراکە!

دوای ئەوە پیاوە پیرەکە گەڕایەوەو لە نێو گژو گیاکەدا بزر بوو.

## پێنج

کەمێك دواتر جیمز زۆر بە خێرایی ڕای دەکرد بۆ ماڵەوە. لەبەر خۆیەوە دەیوت، دەتوانێ تێکڕای ئەم کارانە لە ناو چێشتخانەدا ئەنجام بدات ــ خۆزگە دەیتوانی بڕوات بۆ چێشتخانە بێ ئەوەی پورە ئیسپانج وپورە ئیسپایکر ببیبینن. زۆر خۆشحال بوو، لە نێو چیمەنە بەرزەکان و چەقڵ و چاڵدا بازی دەداو بە لایەوە گرنگ نەبوو لە ئەژنۆ رووتەکانی دەئالێن و بریندار دەبن. لە دوورەوە دەیتوانی پورە ئیسپانج و ئیسپایکر ببینێ کە لەسەر کورسیەکانیان دانیشتبوون و پشتیان لە جیمز بوو. ڕێگایەکەی بە لایەکی تردا گۆڕی تا لێیان دوور کەوێتەوە و بڕواتە لایەکەی تری ماڵەکە.

بەڵام لەناکاو، کاتێك دەیویست لە ژێر درەختە کۆخە پیرەکە رەت بێت کە دروست لە ناوە راستی باغەکە بوو، لاقی هەڵخلیسکاو بەرەو دم لەسەر چیمەنەکان بە ئەرزدا کەوت. پاکەتەکەی لە دەستی بەربۆوەو دەنکە سەوزەکان پەرش و بڵاو بوون.

جیمز دەست بە جێ لەسەر دەست و ئەژنۆیەکانی بڵند بۆوەو دەستی کرد بە گەڕان بە دوای گەنجینە بە نرخەکەی دا. بەڵام چی روویدا؟ هەموویان خەریك بوون بە زەوی دا رۆدەچوون! بەڕاستی دەیتوانی بیان بینێ کە غلۆر دەبوونەوەو رێگەیان بۆ خوارەوە، بۆ ناو ئەرزە رەقەکە دەکردەوە. خێرا دەستی درێژ کرد هەتا هەندێکیان پێش ئەوەی زۆر درەنگ بێ، هەڵبگرێتەوە بەڵام ئەوان دروست لە ژێر پەنجەکانی دا بزر بوون. دوای چەند دانەی تر کەوت دیسان بە هەمان شێوەیان لێهات! وەك شێتان دەستی کرد بەگەڕان بە چوار دەست و پێێ بەو لاو بەو لایاندا دەرۆیشت بە هیوای ئەوەی ئەوانەی ماوەن هەڵیان بگرێتەوە، بەڵام خێرایەکەیان لەوە زیاتر بوو جیمز تۆزیان بیشکێنێ. هەر جارە کە خەریك دەبوو سەر پەنجەی جیمزیان بەربکەوێ، لە ناو ئەرزدا غەیب دەبوون! زۆر بە خێرایی، تەنیا لە ماوەی چەند چرکەیەکدا، یەك یەکی دەنکەکان بزر بوون!

جیمز دەستی کرد بە گریان. ئیتر نەیدەتوانی بیان گەڕێنێتەوە ــ ئەوان بزر ببوون، بزر بوون، بۆ هەمیشە بزر بوون.

بۆ کوێ چوون؟ لەبەر چی ئاوا تامەزرۆ بوون بە زەوی دا رۆبچن؟ بە دوای چییەوە بوون؟ خوارەوە هیچ شتێکی لێنەبوو، هیچ شتێك جگە لە رەگەکانی دار کۆخە پیرەکە... و یەك دنیا کرمی خاکی و هەزارپێی و ئەو مێش و مەگەزەی لە زەویدا دەژیان.

بەراستی ئەو پیاوە پیرە چی وت؟ ***بەهەرکەسێك بگەن، چ بەلا بێ، چ مێش و مەگەز، چ ئاژەڵ یا درەخت، هەرچی هێزی جادویی ئەوانە بۆ ئەو شتە دەگوێزرێتەوە.***

جیمز بیری کردەوە، ئەی خوایە گیان ئەگەر ئەوانە بگەنە کرمێکی خاکی یا یەك هەزار پێ، یا جاڵجاڵۆکەیەك، چی روو دەدا؟ و ئەگەر بچنە ناو رەگی دار کۆخەکە، چی؟

لە ناکاو هاوارێك گەیشتە گوێی جیمز: دەعبا، تەمبەڵ، خێراکە وەرە! جیمز تەماشای سەرەوەی کرد و پورە ئیسپایکری دیت کە بە سەر سەریەوە وەستاوە، تورە و باریك و درێژ، بە چاویلکە بێ دەسك و چوارچێوە فلزیەکەی چاوی لە جیمز بڕیوە. فەرمانی پێکرد: خێراکە بگەڕێوە هەموو دارەکان بشکێنە.

پورە ئیسپانج، قەڵە و شلٌ و پل کە رێك لە بووکی دەریایی دەچوو، بە لۆژە لۆژ خۆی گەیاندە پشت سەری خوشکەکەی تا بزانێ چی روویداوە. پێشنیاری کرد: وەرە با ئەو کوڕە بخەینە ناو سەتڵێك و بە دیوارەوە

هەڵیواسین و، لێی گەڕێین بە درێژایی شەو بەو شێوەیە بمێنێتەوە. ئەوە وانەیەکی باشە بۆ ئەوەی جارێکی تر تەواوی رۆژەکە بە فیڕۆ نەدات.

ئیسپانجی ئازیزم، ئەوە بیرۆکەیەکی باشە، بەڵام با سەرەتا ناچاری بکەم ورد کردنی دارەکان تەواو بکات. هەی سیسی رەزاگران، هەر ئێستاکە بڕۆ کەمێك کار بکە!

جیمزی داماو و غەمگین بە هێواشی هەستایەوە سەرپێی و گەڕایەوە بۆ لای دارەکان. ئاخ! خۆزگە هەڵنەخلیسکابا و ئەو پاکەتە بە نرخەی لێ نەکەوتبا. ئەوەتا هەموو هیواو ئومێدی بۆ ژیانێکی باشترو خۆشتر لە ناوچووە. ئەمڕۆ و سبەی و رۆژی دواتر و هەموو رۆژەکانی تر، جگە لە لێدان، ناخۆشی، خەم و نائومێدی شتێکی تری بۆ نەماوەتەوە.

تەورەکەی هەڵگرت و خەریك بوو دەست بکات بە شکاندنی دارەکان، کە دەنگی هاوارێکی لە پشت سەریەوە بیست. دەستی لە کار کێشایەوەو گەڕایەوە.

## شەش

ئیسپانج! ئیسپانج! زوو وەرە ئێرە سەیرکە!

چی؟

پورە ئیسپایکر هاواری دەکرد: کۆخێکە!

چی؟

یەك کۆخ! دروست لەو سەرەوە، لەسەر بەرزترین لقی دارەکە! نایبینی؟



دلّنیام تۆ

هەڵەی، ئیسپایکری ئازیزم. ئەو دارە بێ بەختە هەرگیز کۆخی نەگرتووە.

ئیسپانج، ئێستاکە کۆخێکی پێوەیە! دەتوانی بێی بەچاوی خۆت بیبینی!

ئیسپایکر: خەریکی گاڵتەم پێدەکەی. تامی تامیم دەدەی لەحاڵێکدا هیچ شتێکی لیٚ نییە بۆ خواردن. ئەو دارە هەرگیز، هەتا یەك گلوکی نەگرتووە، چ بگات بە کۆخ. وتت دروست لەو سەرەوە لەسەر بڵندترین لقە؟ من کە هیچ شتێك نابینم. زۆر گاڵتە جارییە...ها، ها...

ئەی خوایە !زۆر سەرسامم! بە راستی کۆخێك لەو سەرەوەیە؟!

پورە ئیسپایکر وتی: یەکێکی گەورە و باش!

پورە ئیسپانج هاواری کرد: یەك دانەی جوان، یەك دانەی جوان!

لەو کاتەدا جیمز تەورەکەی داناو گەڕایەوە، سەیرێکی ئەو دوو ژنەی کرد، کە لە ژێر دار کۆخەکە وەستابوون. ***خەریکە شتێك روو دەدات.*** ئەو بیری دەکردەوە، دوور نییە هەر ساتە رووداوێکی سەیر روو بدات. هیچ زانیاریەکی نەبوو چ رووداوێك، بەڵام بە تەواوی هەستی دەکرد کە بەم زووانە شتێك روو دەدات. دەیتوانی لە دەوروبەری خۆی... هەست بەو بێ دەنگیەی بکا کە لە ناکاو باڵی بەسەر باغەکەدا کێشا.

جیمز وردە وردە لە دارەکە نزیك بۆوە. پورەکانی ئیتر قسەیان نەدەکرد. ئەوان تەنیا لەویٚ وەستابوون و چاویان لە کۆخەکە بڕیبوو. دنیا کش و مات

بوو، تەنانەت دەنگی باش نەدەهات، ڕۆژ لە سەر سەریانەوە، لە ناوەراستی ئاسمانی سامالّ و شین دەدرەوشایەوە.

پورە ئیسپایکر بێدەنگیەکەی شکاند و وتی: بەڕای من ئەو کۆخە گەیشتووە.

پورە ئیسپایکر لە کاتێکدا لێوە ئەستورەکانی دەلستەوە پێشنیاری کرد: وا باشە بیخۆین. هەر کامێکمان دەتوانین نیوەی بخۆیین. ئەهای جیمز! خێراکە وەرە ئێرە و بچۆ سەر ئەو دارە!

جیمز چوو بۆ لایان.

پورە ئیسپانج وتی: دەمەوێ ئەو کۆخە لێبکەیتەوە کەلەسەر بەرزترین لقی دارەکەیە. دەیبینی؟

بەڵێ پورێ، دەیبینم!

بیرۆکەی خواردنی کۆخەکە، لە سەرت دەرکە. بڕیارە پورە ئیسپایکر و من لێرە و هەر ئێستاکە کۆخەکە لە نێوان خۆماندا بەش بکەین و هەریەکە نیوەمان بەر دەکەوێ. دەست پێبکە! سەرکەوە! جیمز بە دارەکەدا سەرکەوت.

پورە ئیسایکر یەکسەر وتی: بوەستە! لێی مەکەوە! بە دەمی کراوە و چاوە زەقەکانی، وەك ئەوەی روحی دیتبێ، لە لقەکانی دارەکە ڕاما. وتی: سەیرکە! سەیرکە! ئیسپانج، سەیرکە!

پورە ئیسپانج لێی پرسی: ئەوە چیتە؟

پورە ئیسپایکر هاواری کرد: خەریکە گەورەتر و گەورەتر دەبێ!

چی؟

دیارە، کۆخەکە!

گاڵتە دەکەی!

دەفەرموو خۆت سەیری بکە.

بەڵام ئیسپایکری ئازیزم، ئەوە زۆر مەحاڵ وگێلانەیە، ئەوە ـــ ئەوە ـــ ئەوەـــ کەمێك سەبر بگرەـــ ناـ ناـ راست نییەـ نا ـ بەڵێ ـ خوایە گیان! بەراستی خەریکە گەورەتر دەبێ!

پورە ئیسپایکر هاواری کرد: ئەوەتا نزیکەی دوو ئەوەندەی لێ هات.

راست نییە!

راستە!

ئەوە یەك موعجیزەیە.

سەیرکە! سەیرکە!

ئەوەتا سەیری دەکەم.

پورە ئیسپایکر هاواری کرد: ئاخ خوایە گیان! بە راستی دەیبینم کە ئەو شتە لە بەرچاوم زل و ئەستور دەبێ!

# حەوت

دوو ژن و کوڕێکی بچووك بێ هەست لەناو چیمەنی ژێر درەختەکە وەستابوون و سەیری ئەو میوە سەیرو سەمەرەیان دەکرد. دەمو چاوە بچووکەکەی جیمز بە سەرسامییەوە بریقەی دەدا، چاوەکانی لەبەر گەورەیی و وەك دوو ئەستێرە دەدرەوشانەوە. کۆخەکەی دەبینی کە ئەستوور دەبوو، گەورە و گەورەتر دەبوو. ئەوندە روون بوو دەتگوت میزەڵانە و فووی تێدەکەن.

لە ماوەی نیو خولەکدا دا بە قەدەر یەك شوتی لێ هات!

بە نیو خولەکی تر دوو ئەوەندەی لێ هات!

پورە ئیسپایکر بە دەنگێکی بەرزەوە وتی: تو خوا سەیری کەن چۆن گەشە دەکات.

پورە ئیسپانج لەو کاتەی کە دەستە قەڵەوەکانی دەجوڵاند دەستی کردبوو بە سەماو سوڕدان، هاواری کرد: دەتانەوێ بەو شێوەیە گەشە بکات؟

ئەوەتا کۆخەکە ئەوەندە گەورە بووە کە وەکو کولەکەی مرەبا و بە رەنگی بێجی و زەبەلاح بەدارەکەوە هەڵواسراوە.

پورە ئیسپایکر هاواری کرد: کوڕە گێلەکە، خێراکە لەو درەختە دوور بکەوە.

دڵنیام بە تەکانێکی زۆر بچووك بەردەبێتەوە! لانی کەم کێشی دە یان پازدە کیلو دەبێ!

ئەو لقەی کۆخەکەی گرتبوو، لەبەر قورسایی میوەکە، دەستی کرد بە شۆڕ بوونەوە زۆرتر و زۆرتر بۆ لای خوارەوە. پورە ئیسپانج هاواری کرد: بڕۆ دواوە! خەریکە لقەکە دەشکێ و بەردەبێتەوە!

لقەکە نەشکا. تا کۆخەکە قورس و قورستر دەبوو، لقەکە زیاترو زیاتر شۆڕ دەبۆوە. کۆخەکەش تا دەهات گەورەتر دەبوو.

خولەکێك دواتر ئەو میوە زەبەلاحە گەیشتە قەبارە و خڕی پورە ئیسپانج و بە هەمان قورسی.

پورە ئیسپایکر بە دەنگێکی بەرزەوە وتی: ئێستا کاتی ئەوەیە گەورە بوونەکەی راوەستێ. خۆ ناکرێ هەر گەورە بێ.

بەڵام گەشەی کۆخەکە رانەوەستا.

زۆر بە زوویی بە قەدەرئۆتۆمبیلێکی بچووکی لێهات کە لە نێوان ئەرز و ئاسماندا هەڵواسرابوو.

هەردوو پورەکان لە دەوری دارەکە هەڵدەپەڕین، چەپڵەیان لێدەداو لەبەر خۆشحاڵیان هەر شتێکی گێلانەیان بەدەمدا هاتبا دا بە دەنگێکی بەرز دەیانوت.

پورە ئیسپایکر هاواری کرد: ئای! چ کۆخێکە! چ کۆخێکە!

پورە ئیسپانج هاواری کرد: لەرادەبەدەرە! شەل شوڕهێنەلە! بە سکۆیە! چ خۆلاکێکە!

هێستا هەل گەورە دەبیّ!

دەزانم! دەزانم!

جیمز لەو رووداوانە وەها سەری سوڕمابوو، هەر ئەوەندە دەیتوانی بەسەر پێوە راوەستیّ و چاو زەق کات و لەبەر خۆیەوە بە ئارامی بڵێت: ئاخ! چەند جوانە! جوانترین شتە کە تا ئێستا بینیومە.

پورە ئیسپایکر بە رێکەوت گوێی لە قسەکەی بوو و بە دەنگە گڕەکەیەوە وتی: " بێدەنگ بە، گەمژە! هیچ پەیوەندیەکی بە تۆوە نییە.

پورە ئیسپانج رایگەیاند: راستە! شتێك کە پەیوەندی بە تۆوە نییە! لێی دوورکەوە!

پورە ئیسپایکر هاواری کرد: سەیرکە! لە جاران خێراتر گەورە دەبێ! خێرایەکەی زیادی کردووە!

دەبینم ئیسپایکر! دەبینم! دەبینم!

کۆخەکە گەورەو گەورەتر بوو، گەورەترو گەورەترو گەورەتر.

دواتر بەرزیەکەی گەیشتە نزیکە بەرزی ئەو دارەی لەسەری روابوو، لەراستیدا بە بڵندی و پانی خانوویەکی بچووك. بنەکەی بە نەرمی بەر زەوی کەوت و لە هەمان شوێن وەستا.

پورە ئیسپانج هاواری کرد: گەشەکەی وەستا!

نا نەوەستاوە!

با وەستاوە!

خێرایەکەی کەم بۆوە، ئیسپایکر، خێرایەکەی کەم بۆوە! بەڵام هێشتا هەر رانەوەستاوە، سەیرکە!

چرکە ساتێك وەستا!

ئێستاکە وەستاوە!

وابزانم راست دەکەی!

بەڕای تۆ مەترسدار نییە ئەگەر دەستی لێدەیین؟

نازانم، وا باشە ئاگادار بین.

پورە ئیسپانج و پورە ئیسپایکر وردە وردە بە دەورەی کۆخەکەدا دەهاتن و دەچوون و زۆر بە هێواشی لە هەموو لایانەوە لێی ورد دەبوونەوە. وەك دوو راوچی بوون کە گوللەیان بە فیلێکەوە نابێ و دڵنیا نەبن لەوەی کە مردووە یا نا. و ئەو میوە خڕو گەورەیە، لەسەر سەری ئەوانەوە وەها سەری بۆ ئاسمان بەرز کردبۆوە کە ئەوان لە تەکیا وەك ئەوەی مرۆڤی وردیلەی جیهانێکی تر بن.

پێستی کۆخەکە زۆر جوان بوو ــ بێجیەکی تۆخ بە پەڵەی پەمەیی و سووری بریقەدارەوە. پورە ئیسپانج بە هێواشی لێی چوو پێشەوەو بە نوکی پەنجەکانی دەستی لێدا. هاواری کرد: گەیوە! زۆر گەیوە! سەیرکە! ئیسپایکر! واباشە بڕۆین و خاکەنازێك بێنین و لەتێکی گەورەی لێبکەینەوە بۆ خۆم و خۆت و بیخۆین!

پورە ئیسپایکر وتی: نا، هێشتا نا!

بۆچی نا؟ چونکە من دەڵێم.

پورە ئیسپانج هاواری کرد: بەڵام من ناتوانم چاوەڕوان بم! دەمی پڕ ببوو لە ئاو، لیکاو تك تك بە گۆشەی چەناگەی دا دەچۆڕایەوە.

پورە ئیسپایکر بە چاو ئیشارەتی خوشکەکەی کردو بە زەردە خەنەیەکی ژیرانە کە لەسەر لێوە باریکەکانی بوو بە ئارامی وتی: ئیسپانجی ئازیزم! تەنیا ئەگەر بە باشی کار بکەین، دەتوانین کۆمەڵێك پارەی لێ بەدەست بێنین. سەبرکە دەیبینی.

## هەشت

ئەو خەبەرەی کە کۆخێك بە گەورەیی نزیکەی خانوویەك، بە یەك جار لە باغی کەسێکدا رووداوە، وەکو ئاگرێکی بێ ئامان، بە خێرایی لە گوندەکەدا دەنگی دایەوە، رۆژی دواتر، خەڵك وەك مار و مێرو، بە هەورازی توند و ناخۆشی گردەکەدا هەڵگەڕان تا ئەو موعجیزەیە ببینن.

پورە ئیسپانج و پورە ئیسپایکر بە خێرایی دارتاشیان هێنان تا مەحەجەرەی توندو تۆڵ بە دەوری کۆخەکەدا بکێشن تا لە هێرشی خەڵك لە ئەمان دا بێ و لە هەمان کاتدا، ئەو دوو ژنە زیرەکە، بە دەستە بلیتەکانەوە، لە پێش دەرگای چوونە ژوورەوە جێگیر بوون، دەستیان کرد بە وەرگرتنی پارە لەو کەسانەی دەیانویست بچنە ژوورەوە.

پورە ئیسپایکر هاواری کرد: پەلە بکەن! پەلە بکەن! تەنیا شیلینگێک[٤] بۆ سەیر کردنی کۆخی زەبەلاح!

پورە ئیسپانج هاواری کرد: بۆ منداڵی ژێر شەش مانگ، نیوەی ئەو نرخە!

تکایە یەك یەك! پاڵ مەنێن! پاڵ مەنێن! هەمووتان دەچنە ژوورەوە.

---

٤- شیلینگ دراوی بەریتانیا تا ساڵی ١٩٧١ ز، یەك بیستەمی پاوەند بوو

هێی تۆ، بگەڕێوە! تۆ پارەت نەداوە!

تا نیوەڕۆ ئەو شوێنە پڕ بوو لە خەڵك. پیاوان، ئافرەتان، منداڵان، هەموو یەکتریان پاڵ پێوە دەناو دەهاتنە پێشەوە تا سەیرێکی ئەو میوە سەیرو موعجیزەیە بکەن.

هەلی کۆپتەرەکان وەك زەرگەتە لەسەر هەموو بەشەکانی گردەکە نیشتن، پەیامنێرانی رۆژنامە، وێنەگران و کەسانێك لە کۆمپانیاکانی تەلەفزیۆن رژانە دەرەوە.

پورە ئیسپایکر هاواری کرد: ئێوە کامێرە دێنن، دەبێ دوو ئەوەندە پارە بدەن.

ئەوان وڵامیان دایەوە: زۆر باشە، زۆر باشە، گرنگ نییە! و هەر پارە بوو دەڕژایە باخەڵی ئەو دوو پورە چاوچنۆکە.

لە کاتێکدا لە دەرەوە هەموو ئەو شتانە رووی دەدا، جیمزی داماویان ناچار کردبوو لە ژوورەکەی دا بمێنێتەوە و دەرگایان لەسەر داخستبوو. جیمز لە نێوان مەحەجەرەکانی پەنجەرەی ژوورەکەوە بە دزی سەیری خەڵکەکەی دەکرد.

پورە ئیسپایکر ئەو رۆژە بەیانی زوو وتبووی: ئەگەر رێگە بدەم ئەو دەعبا قێزەونە لەم دەورەوبەرە بێت و بچێت، تەنیا بەردەستمان دەگرێت.

جیمز لێیان پاڕابۆوە: ئاخ، تکا دەکەم! من ساڵانێکی زۆرە هیچ منداڵێکم نەدیوە و یەك دونیا منداڵ دێنە ئێرە کە دەتوانم گەمەیان لەگەڵ بکەم. من دەتوانم لە فرۆشتنی بلیتەکاندا یارمەتیتان بدەم.

پورە ئیسپانج بە نەڕاندنەوە پێی وتبوو: بێدەنگ بە، پورە ئسپایکر و من خەریکە دەبین بە ملیۆنێر، هەر ئەوەمان کەمە یەکێکی وەك تۆ هەموو شتێکمان لێ تێبکداو بەرەس و پێمان بگری.

کاتێك ئێوارەی ڕۆژی یەکەم داهات و خەڵکەکە هەموویان ڕۆیشتنەوە ماڵەکانیان. پورەکانی دەرگای ژووری جیمزیان کردەوە و، فەرمانیان پێی کرد بڕوات و ئەو توێکڵە مۆزو پرتەقاڵ و پارچە کاغەزانەی خەڵك فڕێیان داون، کۆیان بکاتەوە.

جیمیز پرسیاری کرد: ناکرێ جارێ شتێك بخۆم، تکا دەکەم، من بە درێژایی ئەمڕۆ بە برسێتی ماومەتەوە.

ئەوان هاواریان کرد: نا! و لە دەرگاکە فڕێ دایە دەرەوە. وتیان: ئێمە ئەوەندە سەرمان قاڵبووە خواردنمان دروست نەکردووە. ئێستاش خەریکین پارەکان دەژمێرین!

جیمز بە گریانەوە وتی: ئاخر هەوا تاریك بووە!

هاواریان کرد: بڕۆ دەرەوەو تا هەموو شوێنێك خاوێن و ڕێك و پێك نەکەیتەوە، هەر لەوێ بمێنەوە! و دەرگایان قایم پێوەداو دایانخست.

# نـۆ

جیمز برسی و لەرزۆك و تەنیا لە دەرەوە راوەستابوو، نەیدەزانی چ کارێك بکات. ئێستاکە شەوەو هەموو شوێنێك تاریکە، لەو سەرەوەش مانگێکی درەوشاوە لە ئاسماندا لە گەڕاندا بوو. هیچ دەنگ و جوولەیەك لە هیچ شوێنێك نەبوو.

زۆربەی خەڵك ـ بە تایبەتی منداڵان ـ زۆر جار شەوانی مانگەشەو ئەگەر بە تەنیا لە دەرەوە بن، دەترسن. لەو کاتانەدا هەموو شتێك بە شێوەیەکی کوشندە بێدەنگە، سێبەرەکان زۆر بڵند و رەشن و بەردەوام شێوەی سەیرو سەمەر وەخۆ دەگرن، کاتێك سەیریان دەکەی، هەست دەکەی دەجولێن و بچووکترین دەنگ تەنانەت دەنگی لقە دارێك مرۆڤ ڕادەچلەکێنێ.

جیمزیش ئێستا لەو حاڵە دابوو. چاوەکانی کە لە ترسان زەق ببوون سەیری پێش خۆی دەکرد و زاتی نەبوو هەناسە بدات، لە ناو باغەکە کەمێك دوورتر، دەیتوانی کۆخە زەبەلاحەکە ببینێ کە لەو سەرەوە لە هەموو شتێك بەرزو بڵندتر بوو. بە دڵنیاییەوە ئەو شەوە لە پێشتریش گەورەتر ببوو. چ دیمەنێکی سەرنج راکێش! مانگ دەدرەوشایەوەو لەسەر قەدە گەورەو خوارەکەی ئەو دارە گەورەیە و کۆخەکەش بریقەی دەدایەوەو رەنگەکەی

کردبوو بە زیویەکی بلوری. دەتوت تۆپێکی زیوی گەورەیە کە بێ دەنگ و گوماناوی، بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر لەسەر چیمنەکە دانراوە.

و دواتر لەناکاو لەرزەیەك بە هێواش پشتی جیمزی جولاند.

لەبەر خۆیەوە وتی ***دیسان بەمزووانە شتێکی تر، پێشهاتێك تەنانەت سەیرتر لەوەی پێشوو، روو دەدات. لەم رووەوە دڵنیا بوو.***

سەیری دەوروبەری خۆی کردو نەیدەزانی چ شتێك روودەدات. باغ ئارام و لە ژێر تیشکی مانگ، رەنگی زیوینی گرتبوو. نمی شەونم چیمەنەکەیانی تەڕ کردبوو و یەك ملیۆن دڵۆپی شەونم وەکو ئەڵماس لە دەوروبەری جیمز بریقەیان دەدا. ئێستا لەناکاو وا دەهاتە بەرچاو کە هەموو باغەکە و دەوروبەری بەو جادوە زیندوو بۆتەوە.

بێ ئەوەی بزانێ چی دەکات، وەك ئەوەی هێزێکی مگناتیسی بە هێز دەوروبەری گرتبێت، **جیمز هێنری تراتر** بە ئارامی دەستی کرد بە رۆیشتن بۆ لای کۆخە زەبەلاحەکە.

بەسەر ئەو مەحەجەرەی کە بە دەوری دا کێشرابوو، رۆیشت و دروست لە ژێر کۆخەکەدا راوەستاو بۆ سەرەوە، لە قەدی خواری دارەکەوە ڕامابوو. دەستی درێژ کردو بە نەرمی سەرە پەنجەیەکی لێدا. زۆر نەرم و گەرم و کوڵکن بوو، وەك پێستی بەچکە مشکێك. بە ئارامی هەنگاوێك رۆیشتە پێشەوە و رومەتی لە پێستە نەرمەکەی خشاند. و دواتر لەناکاو، بە ڕێکەوت زانی لە لایەکی ژێر کۆخەکە، نزیك زەوی، کونێك لە قەدەی دارکۆخەکە دایە.

## دە

کونەکە کەمێك گەورە بوو، لەو کونانەی ئاژەڵێ بە ئەندازەی رێوی دەتوانێ دروستی بکات. جیمز لە پێش کونەکە چۆکی داداو سەرو شانەکانی بردە ناوی.

خۆی خزاندە ناو کونەکە.

بە چوار دەست و پێی بەردەوام بوو.

بە سەرسامیەوە بیری کردەوە کە ئەوە کون نییە، بەڵکو تونێلە!

تونێلەکە تەڕو تاریك بوو، لە دەوروبەری جیمز، بۆنی نائاسایی کۆخی تازە دەهات. زەوی لە ژێر چۆکیدا تەڕ ببوو. دیوارەکانی شێدار و لینج بوون

و ئاوی کۆخەکە لە سەقفەکەی دەچۆڕایەوە. جیمز زاری کردبۆوەو چەند قەترەی بە زمانی تام کرد. تامی خۆش بوو.

دەیویست بەرەو سەرتر بڕوات، وەك ئەوەی تونێلەکە دروست بە ناو کۆخە زەبەلاحەکەدا تێپەڕێ. جیمز چەند چرکەیەك ڕۆیشت و کەمێك راوەستا و گازێکی لە دیوارەکەی دەگرت. گۆشتی کۆخەکە شیرین و ئاودار و بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر تەڕو تازە بوو.

جیمز دە بیست مەتری دیکەش بە گاگۆڵکە ڕۆیشت و دوایی لەناکاو ـ زرینگ! سەری بە شتێکی زۆر رەق کەوت کە رێگەی لێ گرتبوو. سەیرێکی سەرەوەی کرد. شتێکی رەق وەك دیوار، رەق لەبەردەمی بوو، لە یەکەم سەرنجدا وەك دار دەهاتە پێش چاو. پەنجەکانی لێخشاند رێك لە دار دەچوو . تەنیا پڕ بوو لە قۆرتی بڵندو نەوی و پێچ و لۆچی قووڵ.

وتی: ئەی خوایە گیان! ئێستا دەزانم ئەوە چی یە! من بە بە ناو کۆخەکەدا، گەیشتوومە دەنکەکەی!

دواتر زانی کە دەرگایەکی بچووك لە دیواری دەنکە کۆخەکەدا هەیە، پاڵی پێوەنا دەرگاکە سوڕا و کرایەوە. لە دەرگاکەوە خۆی بە ژوورەکەدا کرد و پێش ئەوەی پێڕابگات سەیرێکی دەوروبەری بکات تا بزانێ لە کوێیە، گوێی لە دەنگێك بوو کە دەیوت: سەیرکەن کێ لێرەیە! یەکی تر وتی: چاوەڕوانت بووین!

جیمز لە جێی خۆی ڕەق بوو و لەو کەسانە ڕاما کە قسەیان دەکرد. لە ترسان ڕەنگی وەك گەچ سپی هەڵگەڕا. ویستی هەستێتەوە سەرپێ بەڵام ئەژنۆکانی دەلەرزین، ناچار بوو دووبارە لەسەر عەردەکە دابنیشێتەوە. ئاوڕێکی دایەوە و لە بیری ئەوە دابوو لەو ڕێگایەوە کە هاتووە بگەڕێتەوە، بەڵام دەرگاکە شوێنەواری نەمابوو. ئەوەتا تەنیا دیوارێکی ڕەق و قاوەیی لە پشتەوەیەتی.

## یازدە

چاوەکانی جیمز کە لە ترسان زەق ببوون بە ئارامی بە دەوری ژوورەکەدا دەگەڕا. چەند بوونەوەرێك بە وردی سەیریان دەکرد. هەندێکیان لەسەر کورسی دانیشتبوون و هەندێکی تر لەسەر قەنەفەکان پاڵیان دابۆوە.

بوونەوەر؟

مێش و مەگەز؟

زۆر جار بە شتێك دەڵێن مێش و مەگەز کە بچووك بێ، مەگەر نا؟ بۆ نموونە کوللە یەکێکە لەو مێش و مەگەزانە.

کوللەیەکی سەوزی پیر بە قەبارەی سەگێکی گەورە رووبەرووی جیمز، لەوسەری ژوورەکە، دانیشتبوو.

لە تەنیشت کوللە پیرەکە جاڵجاڵۆکێکی زەبەلاحی لێ بوو. لە تەنیشت جاڵجاڵۆکەکەش خاڵخاڵۆکێکی زل و زەبەلاح بە نۆ خاڵی رەشی سەر باڵە سوورەکانی، لەوێ بوو.

هەر یەکێك لەو سێیانە لەسەر کورسیەکی شاهانە پاڵیان دابۆوە.

لەسەر قەنەفەکەی تەنیشتیان، هەزار پێیەك و کرمێکی خاکی خۆیان لول دابوو و پاڵیان دابۆوە.

شتێکی ئەستورو سپی کە پتر لە کرمی ئاوریشم دەچوو، لەناو کەفی گۆشەیەکی ژوورەکە خۆی مەڵاس دابوو. بە ئارامی خەوی لێ کەوتبوو و کەس بایەخی پێنەدەدا.

هەر یەکێك لەو بوونەوەرانە لانی کەم بە ئەندازەی جیمز بوون، ئەو تیشکە سەیر و سەوزەی لە کەلێنێکی بنمیچەکەوە دەهاتە ژوورەوە، سەیرکردنی ئەو بوونەوەرانەی زۆر ترسێنەر کردبوو.

جاڵجاڵۆکە لە جیمزەوە ڕامابوو و لەناکاو وتی: برسیمە!

کوللە پیرەکە وتی: من لە برسان خەریکە دەمرم!

خاڵخاڵۆکە هاواری کرد: هەروەها منیش!

هەزارپێ لەسەر قەنەفەکە کەمێکی خۆ رێك کرد وتی: خەریکە هەموومان لە برسان دەمرین.

چوار جووت چاوی رەش و خڕ، هەموو نیگاکان لە سەر جیمز بوو.

هەزار پێ قۆرتێكی دا، وەك ئەوەی بیەوێ لە قەنەفەكە بخزێتە خوارێ ـ بەڵام هەڵنەخلیسكا.

ماوەیەكی دوورو درێژ هیچ جوولەیەك نەبوو ـ بێدەنگیەكی تەواو باڵی بە سەر ژوورەكەدا كێشابوو.

جاڵجاڵۆكە(كەچی جاڵجاڵۆكەكە مێ بوو) زاری كردەوە و زمانە رەش و درێژەكەی بە تامەزرۆوە دڵخۆشكەر لەسەر لێوەكانی سوڕاند. بەو شێوەیەی كە دولا هاتبۆوە، لەناكاو پرسیاری لە جیمز كرد: تۆ برسیت نییە؟

جیمزی داماو پاڵی بە دیوارەكەوە دابوو و لە ترسان دەلەرزی و ئەوندە ترسا بوو نەیدەتوانی وەڵام بداتەوە.

كوللە پیرەكە پرسیاری كرد: چی تە؟ بێ گومان نەخۆشی!

هەزار پێ وتی: هەر چركە ساتێك ئەگەری بێهۆش بوونی هەیە.

خاڵخاڵۆكە هاواری كرد: ئەی خوایە گیان! بوونەوەری داماو، پێموایە وای هەست كردووە ئێمە دەمانەوێ بیخۆیین!

دەنگی پێكەنین لە هەموو لایەك بەرز بۆوە.

ئەوان وتیان: ئاخ خوایە گیان! چ هەستێكی ترسێنەر!

خاڵخاڵۆكە بە میهرەبانیەوە وتی: هیچ مەترسە. ئێمە تەنانەت بیر لە ئازاردانیشت ناكەینەوە. تۆش یەكێكی لە خۆمان، دەدەزانی؟ تۆش یەكێكی لە ئەندامەكان. هەموومان لە بەلەمێك داین.

کوللە پیرەکە وتی: ئێمە بە درێژایی ڕۆژ هەر چاوەڕوانی تۆ بووین. پێمان وابوو ئیتر نایەی. خۆشحاڵم کە سەرکەوتی.

هەزار پێ وتی: تۆش دڵخۆش بە کوڕم! دڵخۆش بە! لەو ماوەیەدا هیوادار بووم بێ و لە دەرهێنانی پۆتینەکانمدا یارمەتیم بدەی. چەند کاتژمێری دەخایەنێ تا بتوانم بۆ خۆم پۆتینەکانم دابکەنم.

## دوازدە

جیمز بیری کردەوە بەڕاستی کاتی دژایەتی کردن نییە. بۆیە ڕۆیشت بۆ ئەو سەری ژوورەکە، ئەو شوێنەی هەزارپێیەکە لێی دانیشتبوو، لە تەنیشت هەزارپێیەکە چۆکی دادا.

هەزارپێ وتی: زۆر سپاس، تۆ زۆر میهرەبانی.

جیمز لەبەر خۆیەوە وتی: تۆ چەند پوتینتت هەیە!

هەزارپێ بە فیزو لەخۆباییەوە وتی: من یەك دونیام پێ هەیە، ڕێك سەد دانە[٥].

کرمی خاکی یەکەم جار بوو قسەی دەکرد، هاواری کرد: دوبارە دەستی پێکردەوە! ناتوانێ دەست لە درۆ کردن سەبارەت بە پێیەکانی هەڵبگرێت. ئەو لەڕاستیدا سەد پێ نییە، تەنیا چل و دوو پێی هەیە! کێشەکە لێرە دایە کە زۆربەی

٥- بە ئینگلیزی هەزارپێ "سەد پێش" ی پێدەگوترێ.

خەڵكی خۆیان بە ژماردنیانەوە ماندوو ناكەن. قسەكەشی هەر بەو شێوەیە قبول دەكەن بە هەر حاڵ، هەزارپێ! بوونی ئەوو هەموو پێیە شتێكی باش نییە.

هەزارپێ شتێكی بە گوێی جیمزدا چرپاند: بەستە زمانە، كوێرە، ناتوانێ ببینێ كەمن چەندە بە سامم.

كرمی خاكی وتی: بەڕای من شاكاری راستەقینە ئەوەیە كە هیچ پێیەكت نەبێ بەڵام بتوانی برۆی.

هەزارپێ هاواری كرد: تۆ بەوە دەڵێی رۆیشتن؟ تۆ یەك خشۆكی، تەنیا ئەوندە! تۆ تەنیا دەخزی!



کرمی خاکی زۆر بە جیدی وتی: من دەخلیسکێم.

هەزارپێ وەڵامی دایەوە: تۆ بوونەوەرێکی لینجی.

کرمی خاکی وتی: لینج نیم، من بوونەوەرێکی بە سوود و خۆشەویستم! دەتوانی لە هەر باغەوانێك دەتەوێ بپرسی و تۆ...

هەزارپێ زاری کردەوەو رایگەیاند: من یەك بەڵام! سەیری هەر چواردەوری ژوورەکەی کرد تا یەکێك پشتراستی بکاتەوە.

خاڵخاڵۆکە زەردە خەنەیەکی بۆ جیمز کردو وتی: هەزارپێ زۆر شانازی بەو مەسەلەیەوە دەکات ئەگەر چی ناتوانم تێبگەم بۆ چی؟

هەزارپێ کە هێشتا زەردە خەنەی هەر لەسەر لێو بوو، هاواری کرد: من پیرە کووللەی لێ دەرچێ تاکە بەڵای ئەم ژوورەم، ئەویش ئیتر لەوە پیرترە بتوانێ بەڵایەك بێ.

کوللە پیرەکە چاوە رەش و گەورەکانی بۆ لای هەزارپێ سوڕاند، بە نیگایەکی ویشك و ساردەوە و بە دەنگێکی دزێو، ئارام و قوڵەوە وتی: ئەی گەنجەکە! من هەرگیز لە ژیانم بەڵا نەبووم. من یەك موزیك ژەنم.

خاڵخاڵۆکە وتی: گوێ بگرە! گوێ بگرە!

هەزارپێ وتی: جیمز، ناوت جیمزە ئیتر، مەگەر نا؟

بەڵێ!

باشە، جیمز، لە تەواوی تەمەنت دا هەزارپێیەکی نایابی وەك منت بینیوە؟

جیمز وەڵامی دایەوە: بە دڵنیاییەوە نا، لەبەر چی تۆ بەو شێوەیەت لێ هاتووە؟

هەزارپێ وتی: زۆر نائاسایی، لە راستیدا زۆر زۆر نائاسایی.

با بۆت بگێڕمەوە چی روویداوە. من، لە ژێر دار کۆخێکی پیر لە ناو باغدا هەموو شتێکم لێکدەداو تێکەڵ دەکرد، کەچی لەپڕدا شتێکی سەوزو بچووك و گاڵتە جاری سوڕا و خۆی بە ناو لوتم داکرد. سەوزی کاڵ بوو بە شێوەیەکی زۆر جوان و قەشەنگ کە وەکو جۆرە بەردێك یا کریستالێکی ورد...

جیمز هاواری کرد: ئاخ، بەڵام من دەزانم ئەو شتە چی بووە.

خاڵخاڵۆکە وتی: ئەو پێشهاتە بۆ منیش روویدا.

خانمی جاڵجاڵۆکەش وتی: منیش! کتوپڕ، گلی ناو ژوورەکە پڕ بوو لەو دەنکە سەوزە بچووکانە.

کرمی خاکی بە فیزە وەوتی: لە راستیدا یەکێکم قوتداوە!

خاڵخاڵۆکەوتی: منیش هەر بەو شێوەیە.

هەزارپێ هاواری کرد: من سیانم قوت دا! بەڵام ئەوە کێ بوو چیرۆکەکەی دەگێڕایەوە؟ قسەکەم پێ مەبڕە!

کوللە پیرەکە رایگەیاند: ئێستا بۆ گێڕانەوەی چیرۆك زۆر درەنگە. کاتی خەوتنە.

هەزارپێ هاواری کرد: ناتوانم بەو پوتینانەوە بخەوم. جیمز، چەندی تر ماوە دەریان بێنی؟

جیمز وتی: وابزانم تاکو ئێستا نزیکەی بیست دانەم دەرهێناوە.

هەزارپێ وتی: کە وابوو هەشتای تر ماوە.

کرمی خاکی بە دەنگێکی بەرز وتی: بیست و دوو دانە، نەك هشتا! دیسان خەریکی درۆ کردنە.

هەزارپێ قاقایەکی کێشا.

خاڵخاڵۆکە وتی: ئەوندە کرمی خاکی سەغڵەت مەکە.

ئەو قسەیە هەزارپێی تووڕە کردو هاواری کرد: من سەغڵەتی دەکەم؟

دوایی کەمێك سوورایەوەو ئیشارەتی بۆ کرمی خاکی کردو بە پێکەنینەوە وتی: پێم بڵێین کێ، کێ سەغڵەت دەکا؟

جیمز پێیوا بوو هەزارپێی خۆشتر دەوێ. بە دڵنیاییەوە ئەو ناشیرین بوو، بەڵام بۆ جیمز گۆڕانکاریەکی گەورە بوو کە تەنانەت بۆ چرکەیەك گوێی لە پێکەنینی کەسێك بێ. بە درێژایی ئەو ماوەیەی کە لەگەڵ پورەکانی بوو، هەرگیز گوێی لێ نەببوو پورە ئیسپانج و پورە ئیسپایکر بە دەنگێکی بەرزە پێبکەنین.

کوللە پیرەکە وتی: ئێمە دەبێ بخەوین. سبەینێ ڕۆژێکی سەختمان لە پێشە. خانمی جاڵجاڵۆکە تکایە ئەگەر دەتوانی جێگاکانمان بۆ ئامادە بکە؟

## سێزدە

چەند چرکەیەك دواتر خانمی جاڵجاڵۆکە یەکەم جێگای ڕاخست. جێگەکە بە دوو داو لە هەر دوو سەریەوە بە سەقفەکەوە هەڵواسرابوو، و لە ڕاستیدا زیاتر لە جۆلانە دەچوو تا جێگەی نوستن. بەڵام شاکار بوو ئەو داوانەی جۆلانەکەی لێ دروستکرابوو، وەکو ئاوریشم لە بەردەم ڕووناکیە کەمەکەی ژوورەکە دەدرەوشانەوە.

خانمی جاڵجاڵۆکە بە کوللە پیرەکەی وت: هیوادارم ئاسودە بی. تا ئەو جێگایەی توانیومە جێگاکەتم گەرم و نەرم دروست کردوە. بە دەزووی زۆر ناسك تەنیومە. جۆری دەرزووەکان زۆر باشترە تەنانەت لە تاڵە دەزووەکانی منیش.

کوللە پیرەکە کاتێك خۆی هەڵدایە ناو جۆلانەکە، وتی: خاتونی ئازیزم، زۆر سپاس، ئاخ، ڕێك ئەو شتەیە کە دەمویست. هەمووتان شەوتان خۆش، شەوتان خۆش.

دواتر خانمی جاڵجاڵۆکە جۆلانەی دواتری تەنیوو خاڵخاڵۆکە چووە ناوی.

دوای ئەوە جۆلانەیەکی دوورو درێژی بۆ هەزارپێ و یەکێکی لەویش درێژتری بۆ کرمی خاکی تەنی.

کاتێك نۆرەی جیمز هات، خانمی جاڵجاڵۆکە پێیوت: تۆ دەتەوێ جێگەکەت چۆن بێ؟ رەق یا نەرم؟

جیمز وەڵامی دایەوە: تکایە با نەرم بێ، زۆر سپاس.

هەزارپێ وتی: توو خوا هێندە سەیری دارو دیوار مەکە و وەرە پۆتینەکانی من دەربێنە! من و تۆ بەو هێواشیەوە هەرگیز ناتوانین بخەوین. تکایە کاتێك پۆتینەکانم دەردێنی، بە جوانی جووت جووت و بە ریز دایان بنێ، بەم شێوەیە هەڵیان مەدە پشتەوە.

جیمز وەك شێتان پۆتینەکانی هەزارپێی دەردەهێنا. هەر یەکەیان قەیتانی هەبوو، کە دەبوو شل بکرێنەوە تا بتوانێ لە پێی بێتە دەرێ و لەوەش خراپتر، قەیتانەکان بە خراپترین شێوە گرێ کوێرەیان لێ درابوو، کە دەبوو بەزەبری نینۆك بکرێنەوە. ترسناك بوو. نزیکەی دوو کاتژمێری خایاند. کاتێك جیمز دوایین پۆتینی دەرهێناو لە ریزی ئەوانی تر لەسەر عەردەکە بە جوانی داینا ـ بە گشتی بیست و یەك جووت بوون ـ هەزارپێ یەکسەر خەوی لێ کەوت.

جیمز لە کاتێکدا بە نەرمی سکی هەزارپێ ی گوشار دا، لەبەر خۆیەوە وتی: هەزارپێ، هەستە، کاتی خەوە.

هەزارپێ کە خەریك بوو چاوەکانی دەکردەوە، وتی: زۆر سپاس رۆڵەی ئازیزم! دواتر لە قەنەفەکە هاتە خوارێ و، بە ئارامی چوو بۆ ئەو سەری ژوورەکە و بە خشەخش خۆی گەیاندە ناو جۆلانەکەی. جیمزیش چوو بۆ ناو جۆلانەکەی خۆی - و ئاخ، لەچاو ئەو جێگە رەق و تەقەی، پورەکانی ناچاریان دەکرد لەسەری بخەوێ، چەند گەرم و ئاسودەیە.

هەزارپێ بە خەواڵۆیی وتی: چرایەکان بکوژێنەوە.

هیچ شتێك رووی نەدا.

دەنگی بەرزتر کردو بانگی کرد: چرایەکان بکوژێنەوە!

جیمز سەیرێکی ژوورەکەی کرد تا بزانێ هەزارپێ لەگەڵ کێیەتی، بەڵام هەموویان خەوتبوون. کوللەی پیر بە دەنگی بەرز پرخەی دەهات. خاڵخاڵۆکە کاتێك هەناسەی دەدا، فیتەیەکی لێ دەهات و، کرمی خاکی وەکو فەنەرێك خۆی لە گۆشەیەکی جۆلانەکە لول دابوو، زارە کراوەکەی دەنگی لێ دەهات. خانمی جاڵجاڵۆکە تۆڕێکی زۆر جوانی لە گۆشەیەکی ژوورەکە بۆ خۆی دروست کردبوو، جیمز ئەوی دیبینی کە دروست لە ناوەراستی تۆڕەکە، خۆی خڕ کردۆتەوە و لە خەوا، بە ئارامی و نارِوونی قسە دەکات.

هەزارپێ بە توڕەییەوە هاواری کرد: وتم ئەو چرایە بکوژێنەوە!

جیمز پرسی: لەگەڵ منتە؟

هەزارپێ وەڵامی دایەوە: دیارە لەگەڵ تۆم نییە، گێلە! ئەو گوڵەئەستێرە شێتە بە هەڵکراوی خەوی لێ کەوتووە! جیمز هەر لە کاتی هاتنی بۆ ژوورەکە، یەکەم جار بوو سەیری سەقفەکەی دەکرد و سەیرترین دیمەنی چاو پێکەوت. شتێك وەك مێشێکی زەبەلاحی بێ باڵ( لانی کەم مەترێك درێژ بوو) لەسەر شەش پێیەکانی لە ناوەراستی سەقفەکە سەرەوبن راوەستابوو و سەر کلکی ئەو بوونەوەرە، بە واتایەکی تەواو دەکرا بڵێین کە ئاگری گرتووە. تیشکێکی سەوزی روون، کلکەکەی وەك گڵۆپێك دەدرەوشایەوە و تەواوی ژوورەکەی رووناك کردبۆوە.

جیمز کە لە تیشکەکەوە ڕامابوو، پرسی: ئەوە گوڵە ئەستێرەیە؟ بەڕای من هیچ لە کرم ناچێ.

هەزارپێ وەڵامی دایەوە: دیارە گوڵە ئەستێرەیە. لانی کەم ئەوە شتیکە کە بۆ خۆی دەیڵێت. هەر چەند تۆ راست دەکەی. ئەو هەر کرم نییە. گوڵە ئەستێرەکان هەرگیز کرم نین. ئەوان تەنیا سیسرکەی بێ باڵن کە شەوانە دەدرەوشێنەوە. هێی بوونەوەری تەمبەڵ، هەستە!

بەڵام گوڵە ئەستێرەکە جوڵەی نەکرد، هەزارپێ لە جۆلانەکەی هاتە خوارێ و یەکێك لە پۆتینەکانی هەڵگرت. لە کاتێکدا پۆتینەکەی بۆ سەقفەکە هەڵدەدا، هاواری کرد: ئەو تیشکە نەفرەتیە بکوژێنەوە!

گوڵەنەستێرەکە بە ئارامی چاوێکی هەڵێناو لە هەزارپێ وە ڕاماو بە ساردی وتی: پێویست ناکات بێ ئەدەبی بکەی، هەر شتێك لە کاتی خۆیدا.

هەزارپێ هاواری کرد: زوو، زوو، زووکە دەنا بۆ خۆم بۆت دەکوژێنمەوە.

گوڵە ئەستێرەکە سەیری خوارەوەی دەکرد، دەستی بۆ جیمز راوەشاندو زەردە خەنەیەکی کردو وتی: ئاخ، سەلام جیمز! ئاگاداری هاتنت نەبووم، بەخێر هاتی کوڕی ئازیزم، بە خێر هاتی و شەو خۆش!

دواتر کلیلی چرایەکەی کوژایەوە.

جیمز هێنری تراتر لە تاریکی شەودا لە کاتێدا چاوەکانی تەواو کرابوونەوە، راکشابوو گوێی لەو دەنگە سەیرانە دەگرت کە بوونەوەرەکانی دەوروبەری لە کاتی خەودا دەریان دێنا ، سەرسام بوو بەوەی کە بەیانی برپیارە چ شتێك روو بدات. ئێستاکە وردە وردە خەریك بوو هۆگری دۆستە نوێیەکانی دەبوو. ئەوان بەو خراپییەی کە بەر چاو دەکەوتن، نەبوون. لەراستیدا هەر خراپ نەبوون. لەگەڵ هەموو ئەو هات و هاوار و مشتومڕەی کە لە نێوانیاندا هەبوو، زۆر میهرەبان و هاوڕێی یەکتر دەهاتنە بەرچاو.

جیمز لەبەر خۆیەوە وتی: شەو خۆش کوللەی پیر، شەو خۆش خاڵخاڵۆکە، شەو خۆش خانمی جاڵجاڵۆکە. بەڵام پێش ئەوەی بتوانێ ناوی هەموویان ببات، زۆر زوو خەوی لێ کەوت.

## چواردە

کەسێك هاواری کرد: ئێمە بەر بووینەوە! لە کۆتاییدا بەربووینە!

جیمز لەخەو هەستاو سەیرێکی دەوروبەری کرد. هەموو بوونەوەرەکان لە جۆلانەکانیان هاتبوونە دەرەوە و بە سەرسامیەوە بە دەوری ژوورەکەدا دەسوڕانەوە. لەناکاو ئەرزەکە بە توندی جولایەوە. وەك ئەوەی بوومەلەرزە بێت.

کوللەی پیر کە بە سەرسامیەوە هەڵبەزو دابەزی دەکرد، هاواری کرد: خەریکە بەڕێ دەکەوین! بە توندو تۆڵی دابنیشن!

جیمز لە کاتێکدا لە جۆلانەکەی دەهاتە خوارەوە، بە دەنگێکی بەرزەوە وتی: بۆ وادەکەن؟ چی رووی دەدا؟

خاڵخاڵۆکە دیار بوو کە بوونەوەرێکی میهرەبانە، هات و لە پێشیەوە راوەستاو وتی: بۆ ئاگاداریت با پێت بڵێم کە ئێمە بۆ هەمیشە لەو گردە ترسناکە کە هەموومان ماوەیەکی زۆرە لێی دەژین، دەڕۆین. ئێمە خەریکی غلۆر بوونەوەین لەو کۆخە جوانەدا بۆ ولاتێکی تر...ولات....ولات...بۆ ولات

جیمز پرسیاری کرد: بۆ کام ولات؟

خاڵخاڵۆکە وتی: گرنگ نییە، بەڵام هیچ شوێنێك خراپتر لەو گردە چۆڵەو ئەو دوو پورە قێزەوەنەت نییە.

هەموویان هاواریان کرد: گوێ بگرە، گوێ بگرە! گوێ بگرە، گوێ بگرە!

خاڵخاڵۆکە بەردەوام بوو: لەوانەیە تۆش ئەوە بزانی کە تەواوی باغەکە هەتا پێش گەیشتن بە لێوارە لێژەکەی گردەکە، لەسەر نشێوێکی توندە و لەبەر ئەوە تەنیا شتێك کە کۆخەکەی لە غلۆر بوونەوە و ڕۆیشتن ڕاگرتووە، ئەو قونچکە ئەستوورەیە کە کۆخەکەی بە دارەکەیەوە نووساندووە. ئەگەر ئەو قونچکە بکرتێنین، ئێمە بەڕێدەکەوین.

هەرکە ژوورەکە جوڵەیەکی توندی کرد، خانمی جاڵجاڵۆکە بانگی کردن: ئاگادار بن، خەریکین بەڕێ دەکەوین.

نا، هێشتا نا!

خاڵخاڵۆکە بەردەوام بوو: ئێستاکە هەزارپێیەکەمان کە دوو شەویلاگی تیژی وەك تیغی هەیە، لەسەرەوەیە لەسەر کۆخەکە تا قونچکەکەی بجوێ. لەڕاستیدا دەبێ ئێستا دەستی پێکردبێ چونکە خەریکی جوڵانین. دەتەوێ بێیە ژێر باڵەکانم تا لە کاتی غلۆر بوونەوەدا، بەملا و بەولادا نەکەوی؟

جیمز وتی: زۆر سپاس، پێموایە بەم شێوەیە باشترە.

دروست لە هەمان کاتدا هەزارپێ دەم و چاوە شاد و پێکەنیناویەکەی لەو کونی سەقفەکەوە هێنایە ژوورەوە و هاواری کرد: کاری من تەواو بوو! بەڕێکەوتین!

ئەوانی تر هاواریان کرد: بەربووینەوە! بەربووینەوە!

هەزارپێ هاواری کرد: سەفەرە کە دەستی پێکرد!

کرمی خاکی لەبەر خۆیەوە وتی: خوا دەزانێ لە کوێ تەواو دەبێ. کارێك کە تۆ دەستی تێوەردەی مانای تەنیا سەر ئێشەو ناخۆشیە.

خاڵخاڵۆکە وتی: قسەی بێ مانا مەکە، ئێمە بەم زووانە سەرسوڕهێنەرترین شوێن و شتی باش و لەرادەبەدەرەکان دەبینین! مەگەر نا، هەزارپێ؟

هەزارپێ بە دەنگێکی بەرز وتی: کێ دەزانێ ئێمە چ شتێك دەبینین!

*لەوانەیە بوونەوەرێك ببینین چل و نۆ سەری گەورەوەی هەبێ*

*کەلە ناو بەفری لوتکەی چیا گەردن کەشە دوورەکان*

*کاتێك سەرمای دەبێ*

*دەبێ هەر چل و نۆ لوتەکانی زوو بە زوو خاوێن کاتەوە*

*لەوانەیە مارێکی ژەهراوی ببینین بە خاڵی وردو درشتی پەمەیی*

*کە هەستاوەتە سەرپێ*

*تا پیاوێکی گەورە حەپەلوش بکات*

*بۆ نانی نیوەڕۆش*

*پێنج نەفەر بریانی ئامادەبکەن و بیان خوات*

*دواتر بۆ نانی ئێوارێ*

*بیر لە هەژدە نەفەری دیکە بکەنەوە!*

لەوانەیە لەو سەفەرەدا ئەژدیهایەك ببینین
یا تاك شاخێك کە دەڵێ یاهاهاها
رەنگە دێوەزمەیەکی کوڵکن ببینین
کە پێیە زەبەلاحەکانی
وەك خێو لە نێوان توکە زۆرو پیسەکەی
هاتۆتە دەر
یا مریشکێکی زۆر جوان
بزۆزو میهرەبان و بە ئەدەب
لەوانەشە هێلکەی مراوی ببینین
کە ئەگەر ئیشتیا بکەی و بیکوڵێنی و بیخۆی
لەناکاو بتەقن
کەللەی سەرت لەناو بەرن
دڵنیام لەو رێیەی پێیدا دەرۆیین
گامێشێکی پێش مێژووی گەورە ببینین
یا مێشکی ژەهراوی زەبەلاح و هار کە ئەگەر بە ئەژنۆیەکانتەوە بدات
چزوەکەی لە مێشکی سەرتەوە دەرپەڕێ بۆ هەوا
لەوانشە بزر ببین، سەرمای سەر کێوەکە بمان بەستێ و ببینە سەهۆڵ
یان بوومەلەرزە بێت و هەموانمان بکوژی

*یا خراپتر لەویش*

*لەسەر دووریانێکی زۆر سەیر*

*سەرمان لێبشێوی*

*بەڵام هەر بیریشی لێ مەکەوە ئەو شتانە زۆر گرنگ نین*

*لێمان گەڕێ غلۆربینەوە، بسوڕێنەوە، هەڵدێرێین*

*دوور کەوینەوەو لەو دوو پورە بە پرتەو بۆڵەو پیرانەت*

*پورە ئیسپانجی خرین*

*پورە ئیسپایکری فەقیرو لاواز*

چرکە ساتێك دواتر... کۆخەکە بە ئارامی، بە بێ دەنگی و نەرمی دەستی کرد بە شۆڕ بوونەوە بۆ پێشەوەو کەوتە جوڵە. ژوورەکە هەموو کەوتە لایەك و، هەموو قەنەفەو شتەکانی سەر عەردی ژوورەکە خزین بۆ لایەکەی تر و بەر دیوارەکان کەوتن. جیمز، خاڵخاڵۆکە، پیرەکوللە، خانمی جاڵجاڵۆکە، کرمی خاکی هەروەها هەزارپێش، کە تازە بە دیوارەکەدا هاتبۆ خوارەوە.

## پازدە

هاوکات لە دەرەوە لە ناو باغ، پورە ئیسپانج و پورە ئیسپایکر تازە لە پێش دەرگای سەرەکی جێگیر ببوون. هەر یەکەیان دەستەیەکی بلیت پێبوو و یەکەم لێشاوی سەردانکەران بەو بەیانییە زووە لە دوورەوە دەرکەوتن، خەریك بوون لە گردەکە بەسەر دەکەوتن تا سەیری کۆخەکە بکەن.

پورە ئیسپایکر دەیگوت: ئێمە دەبێ ئەمڕۆ پارەیەکی زۆر کۆ بکەینەوە. توخوا سەیری ئەو خەڵکە بکە!

پورە ئیسپانج وتی: نازانم دوێنێ شەو ئەو هەتیوە قێزەونەی ئێمە چی بەسەر هات؟ ئیتر نەگەڕایەوە، نەگەڕایەوە؟

پورە ئیسپایکر وتی: لەوانەیە بە تاریکی کەوتبێ ولاقی شکاوە.

پورە ئیسپانج بە زەوقەوە وتی: لەوانەشە ملی شکابێ!

پورە ئیسپایکر کە گۆچانەکەی هەڵدەسوڕاند وتی: تەنیا سەبرکە تا دەستم بیگاتێ، کە تێم گەیاند ئیتر هەرگیز ناوێرێ شەو لە دەرەوە بمێنێتەوە. ئەی خوای من! ئەو دەنگە ترسێنەرە چییە؟

هەردوو ژنەکە سەیری دوور و دەوروبەری خۆیان کرد.

بە دڵنیاییەوە دەنگەکە هی کۆخە زەبەلاحەکە بوو، کە مەحەجەرەی دەوروبەری شکاندبوو و لە هەر چرکە ساتێکدا خێرایی زیاتر دەبوو. غلۆر دەبۆوە و بە باغەکەدا بۆ ئەو شوێنە دەچوو کە پورە ئیسپانج و پورە ئیسپایکری لێی وەستابوو.

ئەوان حەبەسابوون. قیژاندیان و دەستیان کرد بە ڕا کردن. زۆر ترسابوون. هەردووکیان سەر ریگاکەیان بەست. دەستیان کرد بە پاڵ پێوەنان و شان لە شانی یەکتر دان، هەر کامێکیان تەنیا لە بیری پاراستنی گیانی خۆی دابوو. پورە ئیسپانج، ئەوی کە قەڵەو بوو، لەو سندوقەی هێنابووی تا پارەکانی تێباوێ، هەڵەنگووت و بەرەودم کەوت. پورە ئیسپایکریش یەکسەر لە پورە ئیسپانج هەڵەنگووت و بەسەری داکەوت. هەردووکیان لەسەر عەرزی درێژ ببوون و لەگەڵ یەکتر بەشەڕ دەهاتن، چڕنووکیان لە یەکتری دەدا، دەستیان کردبوو بە هات و هاوارو وەك شێتان هەوڵیان دەدا دووبارە هەستنەوە، بەڵام پێش ئەوەی بتوانن هەستنەوە، کۆخە گەورەکە گەیشتە سەریان، دەنگی شکان و ورد بوون هات.

و دواتر بێدەنگی هەموو شوێنێکی داگرت.

کۆخەکە غلۆر بۆوە، لە دواوەشی پورە ئیسپانج و پورە ئیسپایکر لەسەر چیمەنەکە وەکو دوو بووکەلەی کاغەز کە لە کتێبێکی وێنەدا کرابنەوە، بێ گیان و پڵیخاوە، لێی کەوتبوون.

## شازدە

و ئێستاکە کۆخەکە لە ناو باغەکە چۆتە دەرەوە، لەسەر لێواری گردەکە خەرێکی سوڕان و هەڵبەزینەوەیە، بە خێرایەکی سەرسوڕهێنەرەوە لە هەڵدێری گردەکە دەرۆیشتە خوارێ. توندو توندو توندتر دەرۆیشت و ئەو خەڵکانەی کە لە گردەکە سەردەکەوتن لەناکاو چاویان بەو دێوەزمە زەبەلاحە کەوت کە بە لایاندا دەرۆیشتە خوارێ. هەموویان قیژاندیان و بە راست و چەپدا لێك بڵاو بوون.

لە خوارەوەی گردەکە، کۆخەکە لە جادەکە تێپەڕی و لەسەر رێگای خۆی ستونێکی تلگرافی خست و دوو ئۆتۆمبیلیشی پان کردەوە کە لە وێ ڕاگیرابوون. دواتر شێتانە نزیکەی دوازدە مەزرای تێپەڕاندن. تێکڕای مەحەجەرە و پەرێزی سەر رێگاکەی تێك شکاندن. رێك بە ناو گاڕانێك گاوو گۆلی رەسەنی جێرسی[٦]دا رۆیشت و دواتر بە ناو مێگەلە مەڕێك و دواتر بە ناو لەوەڕگایەکی پڕ لە ئەسب و دواتر بەناو حەوشەیەکی پڕ لە بەرازو و دواتر بە خێرایی لادێیەکە پڕ بوو لە لێشاوی بە گوڕی ئاژەڵان کە لە ترسان ڕایان دەکردو سەریان لێ شێوابوو.

---

٦- jersey رەگەزێکی گاو گۆلە و هەروەها ناوی ناوچەیەکیشە.

کۆخەکە هێشتاش بە خێرایەکی زۆرە هەر بەڕێوەبوو، هیچ نیشانەیەکی کەم بوونەوەی خێرایی پێوە دیار نەبوو و گەیشتبوو یەك کیلۆمەتری لادێیەك.

کۆخەکە بۆ خوارەوەی جادەی سەرەکی غلۆر بۆوە، ئەو خەڵکانەی لەسەر رێگاکە بوون لە ترسان بە راست و چەپدا خۆیان هەڵدەدا و لە کۆتایی جادەکەدا رێك خۆی بە دیواری بینایەکی گەورەدا کێشا و لە لایەکەی تری هاتە دەرەوە، دوو کونی خڕو گەورەی لە دیوارە خشتەکەدا بە جێ هێشت. ئەو بینایە کارخانەیەکی بە ناوبانگی دروستکردنی چکولیات بوو، هەر دوا بە دوای ئەوە رووبارێکی گەورەی چکولیاتی گەرم و شل لە کونەکانی دیوارەکە هاتە دەرێ. چرکەیەك دواتر ئەو تۆپەڵە قاوەیی و لینجە بە هەموو شەقامەکانی ناو لادێیەکەدا هاتە خوارێ، لە درزی ژێر دەرگاکان چوو بۆ ناو ماڵ و دوکان و باغ و باغاتی خەڵك. منداڵەکان تا ئەژنۆ بە ناو ئەو شلەیەدا رۆچووبوون، هەر شڵپە شڵپیان بوو، تەنانەت هەندێکیان هەوڵیان دەدا مەلەی تێدا بکەن، هەمووشیان چاوچنۆکانە قومی گەورە گەورەیان لێ دەداو لە خۆشحاڵی دەیان قیژاند.

بەڵام کۆخەکە بەو شێوەیەی کە بە ناو لادێ کەدا دەرۆیشت و دوورتر و دوورتر دەبۆوە، شتێکی خراپی لە دوای خۆی بە جێ دەهێشت. شوێنی گاو گۆل و ئەسپ و بەرازەکان، کۆگا، ڤێلاکان، کادێنەکان و هەر شتێك لەسەر

ڕێگای بوو، وەکو یاری بولینگ سەراوژێری دەکرد. پیاوێکی پیر کە بە ئارامی لە تەنیشت ڕووبارێك دانیشتبوو، کاتێك کۆخەکە بە خێرایی لە تەنیشتیوە تێپەڕ بوو، قولابی ماسی گرتنەکە لە دەستی پەڕی، کۆخەکە وەها لە نزیك ژنێك بە ناوی **دیزی انت ویسل** کە ڕاوەستابوو، تێپەڕی، پێستی لوتە درێژکەی هەڵکەند.

ئایا ئەو کۆخە هیچ کات دەوەستێ؟

بۆچی ڕاوەستێ؟ شتێکی خڕ، هەمیشە و مادام لە سەراوژێری دایە، لە غلۆر بوونەوە بەردەوام دەبێ و لەو بارەشەوە، سەر ڕووی ئەرزەکە تا دەگاتە زەریا هەمووی هەر سەراوژێریی بوو. هەمان زەریا کە ڕۆژی پێشتر جیمز لە پورەکانی پاڕابۆوە تا ڕێی پێی بدەن بڕوات بۆ ئەوێ.

ئێستا بە دڵنیاییەوە جیمز دەیتوانی بچێ بۆ ئەوێ. کۆخەکە لە هەر چرکە ساتێکدا بە خێرایەکی زیاتر بە زەریا و گاشە بەردە سپی و بڵندەکانی کە لە پێش زەریادا بوون، نزیك و نزیکتر دەبوو.

ئەو گاشە بەردانە بە ناوبانگترین گاشە بەردەکانی بەریتانیان و سەدان مەتر بەرزن. لە ژێریانەوە دەریا قووڵ، ساردو برسییە. زۆر لە کەشتیەکان لەگەڵ هەموو سەرنشینەکانیان ڕاکێشراون بۆ ئەوێ، بۆ هەمیشە لەو بەشەی کەناراوەکەدا بزر بوون. ئێستا کۆخەکە تەنیا سەد مەتر لە گاشە بەردەکانەوە دوورە، ئێستا پەنجا مەتر، بیست، دە، پێنج و کاتێك گەیشتە

لێواری گاشە بەردەکە، وا هاتە بەر چاوم کە هەڵبەزییەوە بۆ چەند چرکە ساتێك لە هەوادا سوڕایەوەو سوڕایەوە.

دواتر دەستی کرد بە کەوتنە خوارەوە.

خوارەوە...

خوارەوە...

خوارەوە...

خوارەوە...

خوارەوە...

شلّپ! بە دەنگی شلّپەی لەرادەبەدەر توند بەر ئاوەکە کەوت و وەکو بەردێك نقووم بوو.

## حەڤدە

لەو کاتەدا، دیمەنی ناو کۆخەکە بازارێکی شلەژاو بوو کە هیچ لێکدانەوەیەکی بۆ ناکرێ. جیمز هێنری تراتر بە لەشێکی شین و مۆر هەڵگەڕاو لەسەر عەردی ژوورەکە، لە ناو تۆپەڵێکی لێك ئاڵاو لە هەزار پێ و کرمی خاکی و جاڵجاڵۆکەو خاڵخاڵۆکەو گوڵە ئەستێرە و کوللە دا، درێژ ببوو. لە هەموو مێژووی دونیادا، هیچ کەسێك تا ئەو کاتە سەفەری خراپتر لە سەفەری ئەم بوونەوەرە بێ بەختە نەکردووە. زۆر بە باشی دەستی پێکردبوو، بە یەك

دونیا خۆشی و پێکەنینەوە و بۆ چەند چرکە ساتی یەکەم کاتێك کە کۆخەکە دەستی کرد بە سوڕانەوەی هێواش و ئارام بۆ لای پێشەوە، هیچ کەسێك گرنگی بەو جوڵە کەمە نەداو کاتێك کۆخەکە **تاسەی کرد** کردو هەزار پیێ هاواری کرد: ئەوە پورە ئیسپانج بوو! و دواتر **تاسەی کرد** کرد ئەو پورە ئیسپایکر بوو، دەنگی خۆشحالیەکی زۆر لە هەموو لایەکەوە بەرزبۆوە.

بەڵام هەرکە کۆخەکە لە ناو باغەکە رۆیشتە دەرەوە و بە سەراوژێری توندی گردەکەدا رۆیشتە خوارێ، خێرایەکەی پتر بوو وەك شێتان خۆی هەڵدایە خوارێ، هەموو شتێك بوو بە مۆتەکەیەك. جیمز هەڵدرایە ژێر سەقفەکە، دواتر هاتەوە خوارێ، دوایی بەر دیواری تەنیشتەکانی کەوت، و دواتر دووبارە بۆ سەقفەکە هەڵدرا بۆ سەرەوە و خوارەوە، پشتەوەو پێشەوە، هەر چوار دەوری ژوورەکە. لە هەمان کاتدا بوونەوەرەکانی تریش لە هەوادا بۆ هەر لایەك دەفڕین و کورسی و قەنەفەکانیش بە هەمان شێوە، چل و دوو پۆتینەکانی هەزارپێمان نەوت. هەموو شتەکان و هەمووان بەیەکەوە گرێ درابوون. وەکو دەنکەکانی ناو شەقشەقەیەکی زەبەلاح، کە دێویێك شێتانە رایبوەشێنێ و دەستیش هەڵنەگرێ. لەوەش خراپتر سیستمی رووناکی ژووژەکە واتە گوڵە ئەستێرەکە تووشی کێشە ببوو و ژوورەکە وەکو قیر تاریك بوو. هات و هاوارو قیژە و نەفرەت و ناڵەی ئازار دەبیستراو هەموو شتێك دەسوڕایەوەو دەسوڕایەوە. جیمز چەنگی لە چەند پەتێکی ئەستوور کە بە دیوارەکەوە نووسابوو گیر کردبوو، یەکسەر تێگەیشت ئەو پەتانە پێی

هەزارپێین. هەزارپێ پێلەقەی داویشت تا جیمز لە خۆی دوورخاتەوە، هاواری کرد: ئەی گێلە، بەرم دە! جیمزی هەڵدایە ئەو سەری ژوورەکە و کەوتە سەر پێ کولکنەکانی پیرەکوللە. بۆ جاری دووەم کەوتە سەر پێیەکانی خانمی جاڵجاڵۆکە،( زۆر بێ مانا بوو)، کرمی خاکی بێ چارەو داماویش، هەر جارەی لەو سەری ژوورەکە بۆ ئەو سەری ژوورەکە بە هەوادا دەفڕی، وەکو گورز لەملاو لەولا دەدرا، لە دوایی دا بە ترس و لەرزەوە خۆی لە دەوری جیمز ئاڵاند تا چیتر هەڵنەدرێ.



ئاخ کە سەفەرێکی شێتانە و ترسناك بوو!

بەڵام ئێستا هەموو شتێك تەواو ببووە و ژوورەکە لەناکاو بێ جوڵەو بێدەنگ بوو. هەموویان بە ئارامی و بەدەم ئێش و ئازارەوە دەستیان کرد بە خۆ رزگارکردن لە یەکتر.

هەزارپێ هاواری کرد: کەمێکمان رووناکی پێبدە!

ئەوان هاواریان کرد: بەڵێ، رووناکی، رووناکیمان پێی بدە!

گوڵە ئەستێرەی داماو وەڵامی دایەوە: واخەریکم ، بە هەموو توانامەوە هەوڵ دەدەم. تکایە لەسەرخۆ بن.

هەموویان لە بێدەنگیدا چاوەڕوان بوون.

دواتر تیشکێکی سەوز و لاواز لە کلکی کرمەکە تروسکایەوە و، وردە وردە بەهێزو بەهێزتر بوو تا ئەو رادەیەی، کە دەیانتوانی دەوروبەری خۆیان ببینن.

هەزارپێ کە لە ناو ژوورەکەدا بە لادا دەکەوت، وتی: چ سەفەرێکی خۆش و نایاب!

کرمی خاکی بە ئارامی دەیوت: من هەرگیز وەك جارانم لێ نایەتەوە!

خاڵخاڵۆکە وتی: هەروەها منیش. ئەو سەفەرە نیوە عومری کردم.

پیرەکوللە کە هەوڵی دەدا خۆی خۆشحاڵ نیشان بدات، هاواری کرد: بەڵام دۆستانی ئازیزم، ئێمە گەیشتین!

پرسیاریان کرد: کوێ؟ کوێ؟ گەیشتینە کوێ؟

کوللە پیرەکە وتی: نازانم بەڵام گرەو دەکەم شوێنێکی باشە.

کرمی خاکی بە نائومێدی وتی: ئێمە ئێستاکە لە قوڵایی کانزای خەڵوزی بەردین.

دڵنیام لە چرکەساتەکانی دوایی دا هەر بەرەو خوارو خواروتر دەڕۆیشتین. لە دڵمەوە هەستم پێکرد. هێشتاش هەر هەستی پێدەکەم.

کوللەی پیر وتی: لەوانەیە ئێمە لە ناو وڵاتێکی پڕ لە ئاواز و مۆسیقادا بین.

جیمز بە خۆشحاڵیەوە وتی: یا لە نزیك کەناری دەریا پڕ لە منداڵ لە ناو چەو لمدا، کە ئامادەن گەمەم لەگەڵ بکەن.

خاڵخاڵۆکە، کە ڕەنگی کەمێك زەرد هەڵگەڕابوو، بە ئارامی وتی: ببورن، ئایا من هەڵەم کە وا بیر دەکەمەوە، خەریکین بە ئارامی بەرزدەبینەوە و دەکەوینەوە خوارێ؟

هاواریان کرد: سەرە و خوار؟ مەبەستت چییە؟

کوللە پیرەکە پێیوت: تۆ هێشتاش بە هۆی سەفەرەکەوە گێژی. خولەکێکی تر حاڵت باش دەبێ. هەموو ئامادەن هەر ئێستاکە بڕۆینە سەرەوە و سەیری دەوروبەری خۆمان بکەین؟

هەموو بەیەکەوە وتیان: بەڵێ، بەڵێ، با بڕۆین!

هەزارپێ وتی: من ئامادە نییم بە پێ خواسی بێمە دەرەوە. سەرەتا دەبێ دووبارە پوتینەکانم لە پێ بکەمەوە.

کرمی خاکی وتی: بیکە بە خاتری خوا، دووبارە دەست بەو قۆڕپیاتەی مەکەوە.

خاڵخاڵۆکە وتی: وەرن هەموومان یارمەتی هەزارپێ بدەیین تا زووتر لە پێیان، بکات، وەرن.

هەموویان پێکەوە ئەو کارەیان ئەنجامدا، خانمی جاڵجاڵۆکە نەبێ، خەریکی تەنینی پەیژەیەکی درێژ بوو کە لە ناو عەردی ژوورەکەوە بگاتە سەقفی کۆخەکە. کوللەی پیر قسەیەکی ئاقڵانەی کرد کە نابێ کارێکی مەترسیدار بکەن و لە دەرگای سەرەکی بڕۆنە دەرەوە، چۆنکە نازانین لە کوێین، سەرەتا دەبێ هەمووومان بڕۆینە سەرەوەی کۆخەکە و سەیرێکی دەوروبەر بکەن.

هەر بۆیە نیو کاتژمێر دواتر، کاتێك کە پەیژەکە تەواو بوو و هەڵواسرا، چل و دووهەمین پۆتین، بە ڕێك و پێکی لە چل و دووەهەمین پێی هەزارپێ کرا. هەموو ئامادە بوون بڕۆنە دەرەوە. لە ناو ئەو خۆشی و هات و هاوارەدا: منداڵینە، وەرن بڕۆین! وڵاتی بەڵیندراو! ناتوانم بۆ بینینی سەبر بکەم! هەموویان یەك بە یەك لە پەیژەکە چوونە سەر و، لە تونێلێکی تەنگ

و تاریکی تارادەیەك ستوونی بەڵام کەمێك لێژ، لە سەقفەکەوە ڕۆیشتنە سەرەوە، تا بزر بوون.

## هەژدە

خولەکێك دواتر، لە دەرەوە لە هەوای ئازاد لە بەرزترین بەش، لە نزیك قونچکی کۆخەکە راوەستان و لە بەر تیشکی بە هێزی خۆر چاویان دەتروکاند، بە دڵەڕاوکێوە لە دەوروبەری خۆیان دەڕوانی.

چی بووە؟

ئێمە لە کوێین؟

بەڵام ئەوە مەحاڵە؟

بڕوا ناکەم!

ترسناکە!

خاڵخاڵۆکە وتی: من پێم ووتن کە سەرو خوار دەکەین.

جیمز هاواری کرد: ئێمە لە ناوەراستی دەریاین.

بەراستی ئەوان لە ناوەراستی دەریادا بوون. شەپۆلی بەهێزی ئاو و رەشەبا، زۆر بە خێرایی کۆخەکەی لە کەناراوەکە دوور کردبۆوە و ئیتر وشکایی نەدەبینرا. دەوروبەریان زەریای پان و بەرین و رەش بوو، قووڵ و برسی. شەپۆلی بچووك بەر کۆخەکە دەکەوت.

هەموویان بە دەنگێکی بەرز وتیان: بەڵام ئەوە چۆن روویدا؟ مەزراکان لە کوێن؟ دارستانەکان لە کوێن؟ بەریتانیا لە کوێیە؟ هیچ کەسێك تەنانەت جیمزیش نەیدەزانی ئەوە چۆن روویداوە.

کوللە پیرەکە کە زۆر هەوڵی دەدا ترس و دڵەڕاوکێ لە ناو دەنگیدا بشارێتەوە، وتی: خوشکان و برایان، من زۆر بەداخەوەم کە لەو وەزعە ناخۆشە داین.

کرمی خاکی وتی: ناخۆش! کوللەی پیر و ئازیزم، ئیتر ئێمە تەواو بووین! هەموومان خەریکی مردنین! لەوانەیە من کوێر بم، دەزانی؟ بەڵام شتەکە روون و ئاشکرایە.

هەزارپێ هاواری کرد: پوتینەکانم دەربێنن. ناتوانم بەو پوتینانەوە مەلە بکەم.

خاڵخاڵۆکە بە دەنگێکی بەرزەوە وتی: من هەر مەلە کردنیش نازانم.

گوڵە ئەستێرەکە بە ئاە و ناڵەوە وتی: هەروەها منیش.

خانمی جاڵجاڵۆکە وتی: هەروەها منیش! هیچ کام لەو سێ کچە ناتوانین تۆزقاڵێکیش مەلە بکەین.

جیمز بە ئارامی وتی: بەڵام پێویست ناکات ئێوە مەلە بکەن. ئێمە وا بە باشی لەسەر ئاوەکەین درەنگ یا زوو کەشتی یەك هەر بێرەدا تێپەڕ دەبێ و ئێمەش لەگەڵ خۆی دەبات.

هەموویان بە سەرسامیەوە لە جیمزەوە ڕامابوون.

خاڵخاڵۆکە پرسی: تۆ دڵنیای ناخنکێین؟

جیمز وەڵامی دایەوە: بێ گومان دڵنیام، بۆ خۆتان بڕۆن و ببینن.

هەموویان ڕایان کردە سەر لێواری کۆخەکە و سەیری خوارەوە و ئاوی ژێر خۆیان کرد.

کوللە پیرەکە وتی: ئەو کوڕە ڕاست دەکات، ئێمە بە جوانی لەسەر ئاوەکەین. ئێستاکەش دەبێ دابنیشین و ئارام بین. هەموو شتێك بە خێرو خۆشی تەواو دەبێ.

کرمی خاکی هاواری کرد: ئەوە قسەی بێ مانایە! هەرگیز کۆتایی هیچ شتێك باش نییە و، تۆش ئەوە باش دەزانی.

خاڵخاڵۆکە لە بن گوێ جیمز بە هێواشی وتی: کرمی داماو. ئەو هەموو شتێك وەك کارەسات دەبینێ. ئەو لە شادی و خۆشحاڵی بێزارە و تەنیا کاتێك کە نائومێدە، خۆشحاڵە. مەگەر سەیر نییە؟ بەڕای من، هەر کە یەکێك بوو بە کرمی خاکی ئیتر بەسە بۆ نائومێد بوونی، تۆش وا بیر ناکەیتەوە؟

کرمی خاکی خەریکی قسە کردن بوو: ئەگەر کۆخەکە نقووم نەبێ و ئەگەر ئێمە نەخینکێین، هەموومان لە برسان دمرین. ئەریٚ دەزانن لە دوێنێ بەیانیەوە هیچ شتێکمان ناخواردوە؟

هەزارپێ هاواری کرد: خوایە گیان، ڕاست دەکات. لە کۆتاییدا کرمی خاکیش شتێکی ڕاست و دروستی وت.

کرمی خاکی وتی: ئاشکرایە ڕاست دەکەم، وا دیارە ئێمە ناتوانین لەم دەوروبەرە هیچ شتێك بۆ خواردن پەیدا بکەین. هەموومان دەبێ لاواز و لاوازتر و تینوو تینوتر ببین و، بە ئارامی و بە شێوەیەکی زۆر ترسناك بمرین. من هەر ئێستا خەریکە دەمرم. وردە وردە لەبەر کەمی خواردن وشك دەبم، پێم باشترە بخنکێم.

جیمز وتی: ئاخ خوایە گیان، تۆ دەبێ کوێر بی!

کرمی خاکی نەڕاندی: خۆ تۆ باش دەزانی من کوێرم. چ پێویست دەکات بەسەر چاومی دادەیەوە.

جیمز خێرا وتی: هیچ مەبەستێکم نەبوو، ببورە، بەڵام مەگەر نابینی؟.

کرمی خاکی داماو هاواری کرد: ببینم؟ چۆن دەتوانم ببینم کاتێك کە کوێرم؟

جیمز هەناسەیەکی ئارام و قوڵی هەڵکێشا و بە لەسەرخۆییەوە وتی: مەگەر تۆ ئاگادار نی ئەوەندەمان خواردن هەیە کە دەتوانێ چەندە هەفتە بمانپارێزێ؟

ئەوان وتیان: کوا؟ لە کوێیە؟

ئەوە دیار و ئاشکرایە، کۆخەکە! کەشتیەکەمان هەمووی لە خواردن دروست کراوە!

هاواریان کرد: ئەی خوای گەورە، هەرگیز بیرمان لەوە نەکردبۆوە!

کوللەی پیر کە بە خۆشەویستیەوە دەستی لەسەر شانی جیمز دانابوو، وتی: جیمزی ئازیزم، نازانم ئێمە بە بێ تۆ چیمان دەکرد. تۆ زۆر زیرەکی.

خوشکان وبرایان ئێمە دیسان رزگارمان بوو.

کرمی خاکی وتی: هیچ وانییە. مەگەر ئێوە شێت بوون؟ ئێوە ناتوانن کەشتیەکە بخۆن! ئەوە تەنیا شتێکە کە دەمانپارێزێ.

هەزارپێ وتی: ئەگەر ئەوە نەکەین لە برسان دەمرین!

کوللە پیرەکە وتی: ئەی خوایە، ئەی خوایە، حالّمان لە پێشتریش خراپتر بووە.

خانمی جالّجالّۆکە وتی: ناکرێ تەنیا پارچەیەکی بچووکی لێ بخۆین؟ زۆرم برسیە!

جیمز وەڵامی دایەوە: دەتوانن هەرچەندێکی پێتان خۆشە، بخۆن. چەندان هەفتە دەخایەنێ تا بتوانن چاڵێك لەو کۆخە زەبەلاحە بکەن. بە دڵنیاییەوە دەیبینن، مەگەر نا؟

کوللە پیرەکە چەپڵەی بۆ لێدا و هاواری کرد: ئەی خوایە گیان، دیسان جیمز راست دەکات! چەند هەفتە دەخایەنێ! بەدڵنیاییەوە وایە! بەڵام ئێمە

نابێ لە هەموولایەکەوە تەختایی کەشتیەکەمان کون بکەین. وا باشترە زۆر بە ئاسانی لە تونێلەکەوە کونی بکەین، ئەو تونێلەی کە پێیدا هاتینە سەرێ.

خاڵخاڵۆکە وتی: بیرۆکەیەکی نایابە.

هەزارپێ پرسی: کرمی خاکی، بۆ چی نیگەرانی؟ کێشە چییە؟

کرمی خاکی وتی: کێشە....کێشە....دەی باشە کێشەکە ئەوەیە کە هیچ کێشەیەکمان نییە!

هەموو دەستیان کرد بە پێکەنین: کرمی خاکی، خۆشحاڵ بە، وەرە بخۆ. هەموویان بەرەو زاڵکی تونێلەکە رۆیشتن و، دەستیان کرد بە لێکردنەوەی پارچەی گەورە لە گۆشتی کۆخە زێڕین و ئاودارەکە.

هەزارپێ کە پارچە کۆخەکانی لە دەمی دەئاخنی، وتی: ئای، لە رادەبەدەر خۆشە.

کوللە پیرەکە وتی: بە تامە!

گوڵە ئەستێرەکە وتی: بێ وێنەیە!

خاڵخاڵۆکە زۆر بە فەرمی و ساردی وتی: ئەی خوایە، چەند بە تامە! بە زەردەخەنەوە سەیرێکی جیمزی کرد و ئەویش بە زەردەخەنە وەڵامی دایەوە. بە یەکەوە لەسەر تەختایی کۆخەکە دانیشتن و بە خۆشحاڵیەوە دەستیان کرد بە کۆخ خواردن.

خاڵخاڵۆکە وتی: جیمز دەزانی تا ئەم چرکەساتەش، جگە لەو سنە سەوز و بچووکانەی سەر گوڵی ناو باغەکان، هەرگیز لە ژیانمدا تامی شتێکی ترم نەکردووە. ئەوان تامێکی زۆر خۆشیان هەیە، بەڵام تامی ئەم کۆخە لە وانیش خۆشترە.

خانمی جاڵجاڵۆکە هات تا لەگەڵیان دابنیشێت، وتی: ئایا ئەوە بەشکۆ نییە؟ من تا تامی ئەم کۆخەم نەکردبوو، هەمیشە وامدەزانی ئەو مێشانەی گۆشتن[٧] و ئاودار و گەورەن و بە تۆڕەکەمەوە دەبن، لە دونیادا باشترین خواردنن.

هەزارپێ بە دەنگێکی بەرز وتی: چ تامێك! لەرادەبەدەرە! هیچ شتێك تامی وەك ئەمە نییە و تا ئێستاش نەبووە. دەبوو بمزانیبا، چونکە من خۆشترین خواردنی دونیام تام کردووە! لەو کاتەدا هەزارپێ بە زارێکی پڕ، کە ئاوی کۆخەکە لە چەناگەی دەچۆڕایەوە، کتوپڕ دەستی کرد بە گۆرانی وتن.

من خوادرنی بە تام و سەیرم
زۆر خواردووە
تەپۆی وەك جەڵی، گەنەی سەر پشتی گوێدرێژی شاد

٧- مێشی گۆشت رەنگی سەوزو شینی هەیە و لەسەر کەلاکی گیانلەبەران دەنیشێت

یا لەوانەیە گوێ خێزەکی[٨] کە لە لیتەو ئاوی بۆگەندا کولاون
جوجکە مشکێکی برژاو لەگەڵ پلاو زۆر خۆشە
خۆ ئەگەر چلکاوێکی روونی بەسەردا کەن خۆشتریشە
تا ئەو جێیەی لە یادمە
لەفەی گولی تازەم خواردووە
تێکەڵەی خرچسونە بە لیتە و ئاوی بۆگەنی سەوزو پیس،
زەرگەتەی سورکراوە بە رەشایی لولە سۆبەی مەتبەخ،
چەند قاپ نینۆکە شەیتانە،
لەگەڵ کلکی نەرم و ناسکی مارمێلکە،
چەند دۆلکەش سیسرکی سرکەم خواردووە،
بەلام زۆر جار تەنیا کلوخی کولاو دەخۆم
ئەگەر ورد کرابێ
نینۆکە شەیتانەی بێ سەدەف
کە بە بەهارات سورکرابێتەوە چەند خۆشە
ئایا ئێوە تا ئێستا
هێلکەی ماسی خوێنخۆر کە بە سەروپێی مێش و مەگەز سور کرابێتەوە
خواردوتانە؟

٨-گوێ خەزەك یا گوێ خیزەك، جۆرێك هەزار پێیە

(منیش ئەو کێشەیەم هەیەو ئەو خواردنەم
بە هیچ جۆرێك پێی خۆش نییە)
من لە خواردنەکاندا
عاشقی چەقروزەیەکی تورتی زەرگەتەم
کە لە ناو پارچە نانێکی برژاودا
لەگەڵ رۆنە کەرە تێکەڵ بکرێت،
هەروەها ترشی چەقلەکانی ژیشك چەند بە تامە
ئەگەر لەگەڵ پارچە گۆشتێکی سور کراوە بێ،
لە لاشەی ئەژدیهایەك کە لە داریان داوە
ئەگەر ئەو پارچە گۆشتە کۆن بێ
وابزانم پاوندێك دێنێ
ئەگەر پاوندێك بدەی، وابزانم بە پۆستی خێرا
لە ناو بەرمیلدا دەگاتە دەستت
پێیە قەڵەوەکانی هەشت پێ چەندە خۆشە
کە لەگەڵ چا دەیخۆی
من هەمیشە عاشقی سوسیس بووم
بە تایبەتی سوسیسی لاقە سەوزو قەڵەوەکانی بۆق
و دڵنیام کە ئێوەش لەگەڵم هاوڕان

كە قاپێكی پڕ لە خۆڵ ئەگەر رۆنی مەكینەی پێدابكەین
خواردنێكی خۆشە بۆ شەو
و پێویست ناكات بۆتان شەرح كەم كە ئەو خواردنە بەلاشە،
دەتانەوێ پێتان بلێم بۆ رۆژی لە دایكبوونم چیم دەوێ بۆ نانی شەو؟
نانێكی گەرم كە دروست بكرێ لە لاشەی سەگێكی پودل[9]
لە ناو پارچە سۆندەیەكی ناسكی ئاودار
لەگەڵ جەلییەك كە بۆنی زۆر زۆر ناخۆشە،
جەلییەك كە لە قامكی لاقی چەپی اورمی تورنگ[10] دروستكرابێ
( ئەو جەلییە زۆر خۆشە
بە لام ئەوەش بزانن
كە لە كاتی خواردندا دەبێ لوتتان بگرن).
ئەو خواردنانەی كە بۆم شەرح كردن
لە هیچ كوێ دەست ناكەون،
بەڵام گومانم نییە
ئەگەر یەك ملیۆن لەوانە لە قاپێكدا ئامادە كرابێ
دەتوانم هەمووان بە جێ بێڵم

٩- ناوی جۆرە رەگەزێكی سەگە
١٠- اورمی تورنگ مەمكدارێكی هێلكەكەرە

بۆ یەك پارچەی بچووك و ناسك و خاوێنی
ئەم کۆخە ئازیزە!

ئێستاکە هەموویان خۆشحاڵ بوون. ڕۆژی ڕووناك لە ئاسمانی شیندا دەدرەوشایەوە، ڕۆژێکی ئارام بوو. کۆخی زەبەلاح کە تیشکی ڕۆژ لە تەنیشتەکانیدا بریقەی دەدایەوە، وەکو تۆپێکی زەبەلاحی زێرین بوو کە لە دەریای زیوی دا سەرئاو کەوتبوو دەجوڵایەوە.

## نۆزدە

هەرکە خەریك بوو خواردنەکەیان تەواو بکەن، هەزارپێ هاواری کرد: سەیرکەن!

شتێکی ڕەش و بچووك و جوان لەسەر ئاوەکەیە، سەیرکەن!

هەموو ئاوڕیان دایەوە تا بیبینن.

خانمی جاڵجالوکە وتی: دوو دانەن.

خاڵخاڵۆکە وتی: یەکجار زۆرن.

کرمی خاکی کە نیگەران ببوو، پرسی: ئەوانە چین؟

کوللەی پیر وتی: دەبێ جۆرێك ماسی بن. لەوانەیە بێنە ئێرە بۆ ئەوەی سەلامێکمان لێ بکەن.

کرمی خاکی وتی: کۆسە ماسین! لەسەر هەر شتێك دەتانەوێ گرەو دەکەم، ئەوانە کۆسە ماسین و دێنە ئێرە تا بمان خۆن!

هەزارپێ وتی: چ قسەیەکی بێ مانا! وا هاتە بەر چاو، لەناکاو دەنگی کەمێك لەرزی و پێکەنین لەسەر لێوەکانی بزر بوو.

کرمی خاکی وتی: من دڵنیام ئەوانە کۆسە ماسین! من دەزانم ئەوانە کۆسە ماسین!

و لەراستیدا ئەوانی تریش دەیانزانی بەڵام ئەوەندە ترسابوون کە نەیاندەتوانی قسەکەی پشت راست کەنەوە.

بێدەنگیەکی کورت باڵی بەسەردا کێشابوون. هەموویان بە نیگەرانیەوە چاویان لە خوارەوە بڕیوو، دەیانبینی کۆسە ماسییەکان ئارام ئارام بە دەوری کۆخەکەدا دەسوڕاێنەوە.

هەزارپێ وتی: گریمان ئەوانە کۆسە ماسیش بن، ئەگەر لەو سەرەوە بمێنینەوە، هیچ مەترسییەکیان بۆ ئێمە نییە.

بەڵام هەر لەو کاتەدا کە ئەو قسەی دەکرد، یەکێکیان لەناکاو ڕێگەی خۆی گۆڕی و بە خێرایی ئاوەکەی شەق کردو ڕێك چوو بۆ لای کۆخەکە. کۆسە ماسییەکە کەمێك وەستاو و بە چاوی بچووك و زیرەکەکانی سەیری کردن.

ئەوان هاواریان کرد: لێرە دوور بکەوە! دوور بکەوە! دێوەزمەی پیس و چەپەڵ!

کۆسە ماسییەکە بە ئارامی و بە تەمبەڵی زاری لێکردەوە( ئەوندە گەورە بوو کە دەیتوانی کالسکەیەکی منداڵ بە تەواوی قوت بدات) و هێرشی بۆ کۆخەکە برد.

هەموو بە نیگەرانیەوە سەیریان دەکرد.

ئێستاکە وەك ئەوەی رابەرەکەیان فەرمانی پێدابن ، کۆسە ماسییەکانی تریش بەرەو کۆخەکە کەوتنە مەلە و، بازنەیەکیان بە دەوری کۆخەکەدا دروست کردو و بە تورەییەوە هێرشیان کرد. بە لانی کەمەوە بیسی دانەن، هەموویان پاڵ دەنێن، هێرش دەکەن، کلکیان رادەوشێنن و سەر ئاوەکەیان کردووە بە کەف و کوڵ.

لەناکاو نیگەرانی و قاوو قیژ لە سەرەوەی کۆخەکە دروست بوو.

خانمی جاڵجاڵۆکە پێیەکانی خڕ کردەوەو هاواری کرد: ئاخ، ئیتر فەوتایین! ئەوانە هەموو کۆخەکە دەخۆن و هیچی لێ نامێنێتەوە تا لەسەری راوەستین و دواتریش دەست دەکەن بە خواردنی ئێمە!

خاڵخاڵۆکە هاواری کرد: راست دەکات! ئێمە بۆ هەمیشە فەوتایین.

کرمی خاکی دەینالآند: ئاخ، نامەوێ بخورێم! بەلآم ئەوان لە پێش هەمواندا من دەخۆن چونکە زۆر قەڵەو و ئاودارم، ئێسقانیشم نییە!

خاڵخاڵۆکە رووی کردە جیمز و پرسی: هیچ کارێك نییە ئێمە بتوانین بیکەین؟ تۆ بە دڵنیاییەوە دەتوانی لەم حاڵەتەدا بیرۆکەیەك بۆ رزگار بوونمان بدۆزیتەوە. لەناکاو هەموویان سەیری جیمزیان کرد.

خانمی جاڵجاڵۆکە لێی پاڕایەوە: بیربکەوە جیمز! بیربکەوە!

هەزارپێ وتی: خێراکە جیمز خێرا. دەبێ ریگەیەك هەبێ تا بتوانین بیدۆزینەوە.

چاوەکانیان لە جیمزەوە ڕامابوو، نیگەران و بە شێوەیەکی غەمناك و ئومێدوار.

## بیست

جیمز هێنری تراتر بە ئارامی وتی: رێگایەك هەیە پێم باشە تاقی بکەینەوە. نالێم تێدا سەرکەوتوو دەبین...

کرمی خاکی هاواری کرد: پێمان بڵێ! زووکە پێمان بڵێ! هەزارپێ وتی: هەر چی تۆ بڵێی ئەنجامی دەدەین، بەڵام زووکە پەلە بکە! پەلە!

خاڵخاڵۆکە وتی: بێ دەنگ بەو لێێ گەڕێ با ئەو کوڕە قسەکەی بکات. بەردەوامبە جیمز.

ئەوان کەمێك لە جیمز نزیکتر بوونەوە. هەموویان بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ وەستان.

لە کاتی ئەم چاوەڕوانییەدا دەیانتوانی دەنگی کۆسە ماسییەکان ناو ئاوەکە ببیستن، کە لە ژێرەوە خۆیان لە کۆخەکە دەکوتا. زەبرەکان ئەوەندە بەهێز بوون هەر کەسێکی نیگەران دەکرد.

جیمز بە هێواشی وتی: من...من... بەداخەوە هیچ سوودێکی نییە. و سەری راوەشاند: بەراستی بەداخەوەم. لە بیرم کردبوو کە ئێمە داومان نییە. ئێمە سەدان مەتر داومان پێویستە تا بتوانین ئەو کارە بکەین.

کوللەی پیر بە توندی پرسی: چ جۆرە داوێك؟

هەر جۆرێك بێ بەڵام دەبێ درێژو قایم بێ.

بەڵام کوڕی ئازیزم، ئەوە دروست ئەو شتەیە کە ئێمە هەمانە. هەموو ئەو شتانەی دەتەوێ، هەمانە!

چۆن؟ لە کوێ؟

کوللەی پیر هاواری کرد: کرمی ئاوریشم! تا ئێستا بێ ئاگا بووی لە کرمی ئاوریشم؟ ئەو هێشتاش لە خوارەوە لە ناو کۆخەکەیە! ئەو هەرگیز ناجولێت! تەواوی رۆژەکە لە خوارەوە و بە ئارامی دەخەوێ، بەڵام ئێمە بە ئاسانی دەتوانین بەخەبەری بێنین و ناچاری بکەین داومان بۆ دروست بکات.

خانمی جاڵجاڵۆکە وتی: ئەدی من؟ دەکرێ بپرسم؟ منیش دەتوانم وەك کرمی ئاوریشم داو دروست بکەم. من دەتوانم بە نەخش و نیگاریش بیچنم.

جیمز پرسی: دەتوانی بە ئەندازەی پێویست بچنی؟

هەر چەندەی بتەوێ و، خێراش؟

بەدڵنیاییەوە! بەدڵنیاییەوە!

و قایم؟

قایمترین داو. بە ئەستوری پەنجەی تۆ! بەڵام بۆ چی؟ دەتەوێ چی بکەی؟

جیمز بە توندی رایگەیاند: دەمەوێ ئەم کۆخە لە ئاوەکە بێنمە دەرەوە.

کرمی خاکی هاواری کرد: تۆ شێتی!

ئەو تەنیا رێگەیە.

ئەو کوڕە شێتە.

گاڵتە دەکات.

خاڵخاڵۆکە بە نەرمی وتی: بەردەوام بە جیمز، چۆن چۆنی دەتەوێ ئەو کارە بکەی؟

هەزارپێ بە توڕەییەوە وتی: پێموایە بە هێلیکۆپتەر!

جیمز بە ئارامی وەڵامی دایەوە: باڵندە دەریاییەکان، ئێرە پڕە لە باڵندەی دەریایی! سەیری سەرەوە بکەن.

هەموویان تەماشای سەرەوەیان کرد و پۆلێك باڵندەی دەریاییان بینی، کە لە ئاسماندا دەسوڕانەوە و دەسوڕانەوە.

جیمز بەردەوام بوو: دەمەوێ داوێکی درێژی ئاوریشم هەڵبگرم، سەرێکی لە ملی باڵندەیەکی دەریایی بئاڵێنم و، سەرەکەی تریشی لە قونچکی کۆخەکە گرێ بدەم. ئەو ئاماژەی بۆ قونچکی کۆخەکە کرد، کە وەکو کۆڵەکەیەکی کورتەبنە لە ناوەراستی کۆخەکە دابوو. دواتر دەمەوێ باڵندەیەکی تر بگرم و ئەو کارە دووبارە کەمەوە و دواتر یەکێکی تر و یەکێکی تر.



ئەوان هاواریان کرد: گاڵتە جاڕیە!

گێلانەیە!

بێ مانایە!

بێ سوودە!

شێتانەیە!

و کوللەی پیر وتی: چەند باڵندەی دەریایی چۆن دەتوانن کۆخێکی زەبەلاح وەك ئەوە بەرز کەنەوە و ئێمەشی لەسەر بین؟ ئەوە سەدان و هەزاران باڵندەی پێویستە. جیمز وەڵامی دایەوە: ئێمە کەمی باڵندەمان نییە. بۆخۆتان سەیرکەن. ئێمە لەوانەیە چوارسەد، پێنسەد، شەشسەد... لەوانەشە هەزار دانەمان پێویست بێ... نازانم... من دەبێ لە قولاب تیهاویشتن بەردەوام بم، تا ئەو ئەندازەی کە بۆ بەرز کردنەوەمان پێویستە. ئەوان لە کۆتاییدا ناچارن وەك فدبۆڵ بەرزمان کەنەوە. کاتێك فدبۆڵێکی زۆر بدەیت دەست کەسێك، مەبەستم بە راستی زۆر زۆرە، دەچێتە سەرەوەو هێزی هەڵکێشانی ئەو باڵندە دەریایانە زۆر زیاترە لە فدبۆڵ. ئەگەر کاتی تەواومان هەبێ و، پێش تەواو بوونی کارەکەمان ئەو کۆسە ماسییانە نقوومان نەکەن.

کرمی خاکی وتی: تۆ بە تەواوی تێکچووی و ئەقلت لە دەست داوە!

تۆ چۆن دەتەوێ داوەکە بکەی بە ئالقە و لە ملی باڵندەی بئالێنی؟ پێموایە دەتەوێ بۆ خۆت بفڕی و بیان گری!

هەزارپێ وتی: ئەو کوڕە شێتە!

خاڵخاڵۆکە وتی: بهێڵن با قسەکەی تەواو بکات. جیمز، بەردەوامبە. دەتەوێ چۆناوچۆن ئەو کارە بکەی؟

بە دانانی داو.

داو! چ جۆرە داوێك؟

ئاشکرایە، بە کرمێك. باڵندە دەریایەکان کرمیان پێخۆشە، نەتاندەزانی؟ و لە بەختی ئێمەش، لێرە گەورەترین، قەڵەوترین، پەمەیی ترین، ئاودارترین کرمی خاکیمان هەیە.

کرمی خاکی بە توندی وتی: هەر لێرەدا تەواوی کە! ئیتر بەسە!

ئەوانی تر کە تامەزرۆی وتەکە ببوون، وتیان: بەردەوام بە، بەردەوام بە.

جیمز بەردەوام بوو: باڵندە دەریایەکان ئێستاش ئەویان بینیوە. هەر لەبەر ئەوەشە ژمارەیەکی زۆریان لەسەر سەرمان دەسوڕێنەوە. بەڵام ئەوان تا ئەو کاتەی ئێمە لێرە راوەستاوین، ناوێرن بێنە خوارێ و بیگرن. لەبەر ئەوەش....

کرمی خاکی هاواری کرد: بەسە! بەسە! بەسە! بەسە! من ئەو کارە ناکەم! من رازی نابم! من، من، من، من.

هەزارپێ وتی: بێدەنگ بە! خەریکی ئیشی خۆت بە!

من ئەوەم پێخۆشە.

کرمی خاکی ئازیزم، هەر چۆنێك بێ قەرارە تۆ بخورێی جا جیاوازی چییە کە کۆسە ماسییەکان بتخۆن یان باڵندەی دەریایی؟

من ئەو کارە ناکەم.

کوللەی پیر وتی: با جارێ گوێ لە پلانەکە بگرین!

کرمی خاکی هاواری کرد: بۆ من گرنگ نییە پلانەکە چییە! من نامەوێ پۆلێك باڵندەی دەریای ئەوەندەم دەنووکم لێبدەن تا دەمرم.

هەزارپێ وتی: تۆ دەبیتە قوربانی. ئەوەندە تەمەنەی ماومە قەرزداری تۆ دەبم.

خانمی جاڵجاڵۆکە وتی: هەروەها منیش، ناویشت لە هەموو رۆژنامەکاندا چاپ دەکرێ و دەنووسن: کرمی خاکی گیانی خۆی دەکاتە قوربانی تا دۆستەکانی رزگار بکات...

جیمز پێی وتن: بەڵام ئەو نابێتە قوربانی. ئێستا گوێ لە من بگرن. ئەوە ئەو کارەیە دەبێ بیکەین...

## بیست و یەك

کاتێك جیمز پلانەکەی شیکردەوە ، کوللە پیرەکە بە دەنگێکی بەرزەوە وتی: ئەو پلانە زۆر زیرەکانەیە.

هەزارپێ رایگەیاند: ئەو کوڕە بلیمەتە! لە کۆتاییدا دەتوانم پوتینەکانم لە پێ بکەم!

کرمی خاکی داما و بەناڵەوە وتی: ئاخ، من دەبێ ئەوەندە دەنووکەم بەرکەوێ تا دەمرم.

نا هەرگیز وا نییە.

بۆچی، دەزانم کە دەمرم! هەتا ناتوانم ئەوانەش ببینم کە بۆلام دێن، چونکە من چاوم نییە.

جیمز رۆیشتە پێشەوە، دەستی لە ملی کرم کردو وتی: من ناهێڵم ئەوانە هاتا دەستیشیان بگاتە تۆ. بەڵێن دەدەم کە نەهێڵم. بەڵام دەبێ پەلە بکەین! سەیری خوارەوە بکەن.

کۆسەماسی زیاتر دەوری کۆخەکەیان داوە. هەرکۆسە ماسی بوو لە ناو ئاوەکە هەڵدەقولاَ. لانی کەم نەود یا سەدانە دەبوون و نەفەرەکانی کۆخەکە لەو سەرەوە، دڵنیا بوون کۆخەکە وردە وردە دەچێتە خوارەوە.

جیمز هاواری کرد: هەر کەس لەسەر جێگەی خۆیەوە! خۆتان هەڵدەن! چرکەیەکیش نابێ لەدەست بدەین. جیمز ئێستا سەرکردەیە و هەموویان ئەوە دەزانن. هەرچی جیمز دەیوت، بە قسەیان دەکرد.

جیمز فەرمانی دا: هەمووتان جگە لە کرمی خاکی برۆنە خوارێ.

ئەوان لەخوایان دەویست، لە کاتێکدا لە زالکی تونێلەکەوە دەچوونە ژوورێ، وتیان: بەڵێ! بەڵێ! زووکەن! دەبێ پەلە بکەین!

جیمز هاواری کرد: و تۆ هەزارپێ! خێراکە برۆ بۆ خوارێ و کرمی ئاوریشم بخەرە گەڕ! پێی بڵێ داوێکی وامان بۆ بچنێ بێ وێنە بێت! ژیانی ئێمە پەیوەندی بەو داوەوە هەیە! و هەر ئەو تکایەشم لە ئێوە هەیە، خانمی جاڵجاڵۆکە! زوو برۆنە خوارەوەو دەست بکەن بە تەنینی داوەکە.

## بیست و دوو

لە ماوەی چەند خولەکێك دا هەموو شتێك ئامادە کرا.

بێدەنگی باڵی بەسەر کۆخەکەدا کێشابوو. هیچ کەسێك نەدەبینرا. هیچ کەس جگە لە کرمی خاکی.

نیوەی کرمی خاکی وەك سوسیسێکی پەمەیی و ئەستوورو ئاوداری گەورە، بە بەستە زمانی لە ژێر تیشکی خۆر بوو، تا هەموو باڵندە دەریایەکان ببیبینن. نیوەکەی تری لە خوارەوەو لە ناو تونێلەکەدا هەڵواسرابوو.

جیمز لە نزیك کرمی خاکی لە زالکی تونێلەکە هەڵتوتەکابوو، رێك لە بن تەختایی کۆخەکە، چاوەڕوانی یەکەم باڵندەی دەریایی بوو. جیمیز داوێکی ئاوریشمی بە دەستەوە بوو.

کوللەی پیر و خاڵخاڵۆکە کەمێك خوارتر لە ناو تونێلەکە دابوون و کلکی کرمی خاکیان گرتبوو و ئامادە بوون بە خێرایی، هەرکە جیمز فەرمانی دا، لە مەترسی بی پارێزن و رایبکێشنە خوارێ.

و زۆر لە خوارتر لە ناو دەنکە گەورەکەی کۆخەکە، گوڵە ئەستێرەکە ژوورەکەی رووناك کردبۆوە تا ئەو دوو جۆلایە، واتە کرمی ئاوریشم و خانمی

جالّجالۆکە کە خەریکی چنینن، بەرچاویان روون بێ. هەزارپێش بە خۆشیەوە لە خوارەوە هانیدەدان بۆ کاری زیاتر و، جیمزیش جار بە جار زۆر بە هێواشی گوێی لە دەنگی دەبوو کە هاواری دەکرد: بچنە، کرمی ئاوریشم، بچنە، بوونەوەری زل و قەڵەو و تەمبەڵ ! خێراتر خێراتر دەنا فرێت دەدەمە بەردەمی کۆسە ماسییەکان!

جیمز بە هێواشی وتی: یەکەم باڵندەی دەریایی خەریکە دێت. مەجوڵێ، کرمی خاکی. ئارام بە. بەشەکەی تری جەستەت ئامادەی راکێشانە بۆ خوارەوە!

کرمی خاکی لێی پارایەوە: تکایە رێگە مەدە بەر دەنوکم بدەن.

ناهێڵم، ناهێڵم، وسس....

جیمز لە گۆشەیەکی چاویەوە باڵندەیەکی دەریایی بینی، کە بە خێرایی دێتە خوارێ بۆ لای کرمی خاکی و دواتر لە ناکاو ئەوەندە نزیك بۆوە جیمز توانی چاوە رەش و بچووکەکان و دەنوکە خوارەکەی ببینێ. دەنوکی کرابۆوە و ئامادە بوو پڕداتە کرمەکە و پارچە گۆشتێکی نایاب لە پشتی بکاتەوە.

جیمز هاواری کرد: رایکێشن!

کوللەی پیر و خاڵخاڵۆکە کلکی کرمەکەیان قایم راکێشا و دروست وەکو کاری سێحر بازیی، کرمی خاکی لە ناو تونێلەکەدا بزر بوو. لە هەمان کاتدا جیمز دەستی بەرز کردەوە و باڵندە دەریایەکە رێك فڕی بۆ ناو ئاڵقە

ئاوریشمەکەی کە ئەو رایگرتبوو، و ئاڵقەکە کە بە شارەزایەکی تایبەت دروست کرابوو، بە ئەندازەی پێویست( بەڵام نەك یەکجار زۆر) لە ملی باڵندەکە توند بوو و باڵندەکە کەوتە ناو داوەکە.

کوللەی پیر کە چاوی لە دەرەوەی تونێلەکە بڕیبوو، هاواری کرد: ئافەرین جیمز!

باڵندەی دەریایی فڕی و جیمز داوە ئاوریشمەکەی بەردا تا بەرزی بکاتەوە. جیمز نزیکەی پەنجا مەتر داوی بەردا و دواتر سەرەکەی تری لە قونچکی کۆخەکە بەست.

ئەو لەو کاتەی کە خۆی داویشتە ناو تونێلەکە، هاواری کرد: جارێکی تر! کرمی خاکی وەرەوە سەریٚ! هەزارپیٚ، هەندێکی تر ئاوریشم بێنە!

کرمی خاکی ناڵاندی: ئاخ، من هەرگیز ئەوەم پێخۆش نییە، من تەنیا لە چنگی ئەویتر رامکرد! تەنانەت لەسەر پشتم هەستم بە بای باڵەکانی کرد کە بە خێرایی بەرەو رووم دەهات!

جیمز بە هێواشی وتی: وسس! ئارام بە! یەکێکی تر خەریکە دیٚ.

ئەوان دووبارە هەمان کاریان کردەوە.

و دووبارە، دووبارە و دووبارە باڵندە دەریایەکان بەم شێوەیە هەر دەهاتن و جیمز یەك لە دوای یەك دەیگرتن و لە قونچکی کۆخەکەی دەبەستن.

ئەو لە کاتێکدا ئارەقەی ناوچاوانی دەسڕییەوە، هاواری کرد: سەت دانە باڵندەی دەریایی!

ئەوان هاواریان کرد: بەردەوام بە! بەردەوام بە جیمز!

دوو سەت باڵندەی دەریایی!

سێسەت باڵندەی دەریایی!

چوارسەت باڵندەی دەریایی!

کۆسە ماسییەکان وەك ئەوەی هەستیان بە مەترسی لەدەستدانی نێچیرەکانیانن کرد بێ، بە تووڕەییەکی زیاترەوە قایم خۆیان لە کۆخەکە دەکوتا و کۆخەکەش بەرە بەرە لە ناو ئاوەکەدا دەڕۆیشتە خوارەوە.

جیمز هاواری کرد: پێنسەت باڵندەی دەریایی!

هەزارپێ لە خوارەوە هاواری کرد: کرمی ئاوریشم دەڵێ ئاوریشمەکەی خەریکی تەواو بوونە. دەڵێ ناتوانێ زۆر بەردەوام بێ. هەروەها خانمی جاڵجاڵۆکەش!

جیمز وەڵامی دایەوە: پێیان بڵێ دەبێ بتوانن! ئێستاکە نابێ کارەکەیان رابگرن!

یەکێکیان هاواری کرد: ئێمە خەریکین بەرەو سەر دەڕۆیین!

نا!

من هەست دەکەم!

باڵندەیەکی تر بگرە، خێرا!

هەمووتان بێدەنگ، بێدەنگ! یەکێکیان ئێستا خەریکە دێت!

ئەوە پێنسەت و یەکەم باڵندەی دەریایی بوو، کە جیمز گرتی و لە قونچکی کۆخەکە لە تەنیشت ئەوانی تری بەست، کۆخە زەبەلاحەکە لە ناکاو و بە ئارامی دەستی کرد بە بەرز بوونەوە و هاتنە دەرەوە لە ئاوەکە.

ئاگادار بن! وا دەڕۆین! منداڵینە خۆتان توند بگرن!

بەڵام دواتر وەستا.

و هەڵواسرا.

هەڵواسرابوو جۆلانەی دەکرد بەڵام بەرزتر نە دەبۆوە.

بنی کۆخەکە هیشتا هەر لە ئاوەکە دابوو. دروست وەك تەرازویەکی راست و ورد، کە تەنیا پێویستی بە کەمێك قورسایی بوو تا بە لایەکدا بکەوێت.

کوللەی پیر کە لە تونێلەکەوە سەیری دەرەوەی دەکرد، هاواری کرد: یەکێکی ترمان بەسە. ئێمە تا ئەندازەیەك بەڕێکەوتووین!

ئەمە ئەو چرکەساتە مەزنەیە کە چاوەڕوانی بووین. باڵندەی دەریایی پێنسەت و دووهەمیش بە ئاسانی گیراو لە قونچکی کۆخەکە بەسترا...

و دواتر لە ناکاو...

بەڵام بە ئارامی...

شکۆمەندانە وەك باڵۆنێکی زەردی ئەفسانەیی...

لە کاتێکدا هەموو باڵندە دەریایەکان بە داوەکانەوە بەسترا بوونەوە و هەولێان دەدا خۆیان رزگار بکەن... کۆخە زەبەلاحەکە لە ئاوەکە هاتە دەرەوە و بەرز بۆوە بەرەو ئاسمان.

## بیست و سێ

لە چاو تروکانێکدا، هەموو هاتنەوە سەرەوە بۆ سەر کۆخەکە!

هاواریان کرد: ئاخ چەند جوانە!

خوا حافیز کۆسە ماسییەکان!

ئای، کورە، رێگەی راستی سەفەر کردن ئەمەیە!

خانمی جاڵجاڵۆکە کە لە خۆشیان هاواری دەکرد، خۆی بە ناوقەدی هەزارپێوە نووساند، هەموویان بە دەورەی قونچکی کۆخەدا دەستیان کرد بە سەما کردن. کرمی خاکی لەسەر کلك وەستا بوو لە خۆشیان حەجمینی نەبوو. کوللەی پیر لە هەوادا هەڵبەزو دابەزی دەکرد. خاڵخاڵۆکە بە پەلە رۆیشت و باوەشێکی توندی لە جیمز دا. گوڵەئەستێرە کە لە حاڵەتی ئاسایدا زۆر شەرمن و کەم دوێ بوو، لە نزیك زالکی تونێلەکە دانیشتبوو و بە خۆشحاڵیەوە دەدرەوشایەوە. هەتا کرمی ئاوریشم کە رەنگ زەردو ماندوو دەهاتە بەر چاو، لە تونێلەکە خزایە دەرەوە تا سەیری ئەو فڕینە بکات، کە پتر لە موعجیزە دەچوو.

ئەوان بەرەو سەر و سەروتر دەڕۆیشتن، زۆر بە خێرایی بە ئەندازەی بورجی کەنیسەیەك لەئاستی زەریا بەرزبوونەوە.

جیمز هەرکە سەما کردن و هات و هاوارەکەیان راوەستا، پێی وتن: من کەمێك بۆ کۆخەکە نیگەرانم. نازانم کۆسەکان لە ژێرەوە چەند زیانیان بە کۆخەکە گەیاندوە. مەحاڵە لەو سەرەوە بتوانین لەوە تێبگەین.

خانمی جاڵجاڵۆکە وتی: رێگە بدەن بڕۆمە ئەو تەنیشتە و لێی تێبگەم. هیچ گرنگ نییە، ئاسوودە بن و بێ ئەوەی چاوەڕوانی وەڵام بێت، خێرا داوێکی درێژی ئاوریشمی پەیدا کرد، سەری داوەکەی لەقونچکی کۆخەکە گرێ داو وتی: لە چاو تروکانێکا دەگەڕێمەوە، دواتر بە ئارامی چووە سەر لێواری کۆخەکەو خۆی فڕێدایە خوارێ، لەگەڵ چوونە خوارەوەی داوە ئاوریشمیەکە زیاتر دەکرایەوە.

هەموو ئەوانەی لە گەڵی بوون بە نیگەرانیەوە لە دەوری ئەو شوێنە کۆبوونەوە، کە لێیەوە رۆیشتبۆ خوارێ.

خاڵخاڵۆکە وتی: ئەگەر داوەکە بپچڕێ زۆر مەترسیدارە.

بێدەنگیەکی تەواو باڵی بە سەر ئەو شوێنەدا کێشا.

کوللەی پیر وتی: خانمی جاڵجاڵۆکە، حاڵت باشە؟

دەنگی خانمی جاڵجالوکە لە خوارەوە هات: بەڵێ، سوپاست دەکەم، خەریکە دێمەوە سەرێ. هەنگاو بە هەنگاو بە داوە ئاوریشمەکەدا هاتەوە سەرێ، هەر لەو حاڵەتەدا داوەکەی بە وردی لە ناو خۆیدا خڕ کردەوە.

لێیان پرسی: زۆر خراپە؟ هەمووی خوراوە؟ لە هەموو شوێنێکی کونی گەورە گەورە دروست بووە؟

خانمی جاڵجالوکە بە خۆشحاڵیەوە خۆی گەیاندە سەرەوەی کۆخەکە، بەڵام سەرسامی بە سیمایەوە دیاربوو، وتی: بڕوا ناکەن! لەو خوارەوە زۆر بە زەحمەت شوێنێك دەدۆزیتەوە زیانی پێگەیشتبێ! کۆخەکە هەر دەڵێی دەستی لێنەدراوە. تەنیا لە چەند پارچەیەکی بچووك بەو لاوە کە لێرەو لە وێ هەڵکەندراوە، هیچ شتێکی تر نییە.جیمز پێیوت: بە دڵنیاییەوە تۆ هەڵەی.

هەزارپێ وتی: ئاشکرایە کە ئەوە راست نییە.

خانمی جاڵجالوکە وەڵامی دایەوە: سوێند دەخۆم کە هەڵە نەبووم.

بەڵام سەدان کۆسە ماسی لە دەورمان بوون.

ئەوان ئاوەکەیان کەفاوی کردبوو.

بەڵام دیتمانن چۆن دەمە گەورەکانیان کردەوەو پێکیان دادەدا!

خانمی جاڵجالۆکە وەڵامی دایەوە: بۆ من گرنگ نییە ئێوە چیتان دیوە، ئەوان بە دڵنیاییەوە زیانێکی زۆریان بە کۆخەکە نەگەیاندوە.

هەزار پێ پرسی: ئەدی بۆ ئێمە خەریك بوو دەخنکاین؟

کوللەی پیر ڕای خۆی وت: لەوانەیە ئێمە نقوم نەبووینایە! لەوانەشە ئێمە ئەوەندە ترسابین پێمان وابووە دەخینکێین.



لە راستیدا ئەو بیرۆکە لە هەموو ئەو شتانەی دەیانزانی، لە راستییەوە نزیکتر بوو.

هەر وەك دەزانن کۆسە ماسی قەپۆزی زۆر درێژ و نوك تیژی هەیە، زاری بە شێویەکی زۆر سەیر لە ژێر دەم و چاویەتی و زۆر لە پشتەوەیە. لەبەر ئەوە بۆ کۆسە ماسی تا ئەندازەیەك مەحاڵە ددانەکانی لە شتێکی خوارو ساف و پانی وەك دیواری کۆخەکە بچەقێنێ. تەنانەت ئەگەر هەڵیشگەرێتەوە ناتوانێ، چونکە قەپۆزی هەمیشە رێگەی لێی دەگرێ. ئەگەر تاکو ئێستا سەگێکی بچووکتان بینیبێت کە هەوڵ دەدات ددانەکانی لە تۆپێکی زۆر گەورە بچەقێنێ، ئەو کات دەتوانن وای دابنێن کە ئەو مەسەلەیە لەبارەی کۆسە ماسییەکان و کۆخەکەش دا بەو شێوەیە.

خاڵخاڵۆکە وتی: دەبێ جۆرە سیحرێك بێ. لە وانەیە کونەکان بۆ خۆیان پڕ بووبنەوە.

جیمز هاواری کرد: سەیرکەن! کەشتی یەك لەو خوارەوەیە!

هەموو ڕایان کردە تەنیشتی کۆخەکە. تا ئەو کاتە هیچ کامێکیان کەشتیان نەدیبوو.

وا دیارە گەورەیە.

سێ دوکەڵکێشی هەیە.

تەنانەت ئەو کەسانەش دیارن کە لەسەر سەکۆیەکەی راوەستاون.

وەرن دەستیان بۆ راوەشێنین. پێتان وایە دەتوانن بمان بینن؟

نە جیمزو نە هیچ کامیان ئیتر نەیاندەزانی. بەڵام ئەو کەشتیەی کە لە ژێریانەوە تێدەپەڕی، لەراستیدا کەشتی ***کویین مری***[11] بوو، کە لە کەناڵی بەریتانیاوە دەرۆیشت بۆ ئەمریکا، کەشتیەوانەکە بە سەرسامیەوە لەگەڵ گروپێك ئەفسەر لەسەر سەکۆی ***کویین مری*** راوەستابوون، هەموویان لەو تۆپە خڕ و گەورەیە ڕامابوون، کە بەسەر سەریانەوە هەڵواسرابوو.

کەشتیەوانەکە وتی: ئەوەم خۆش ناوێ.

ئەفسەری یەکەم وتی: هەروەها منیش.

ئەفسەری دووەم وتی: پێتان وایە بەدوامانەویە؟

کەشتیەوانەکە بە قاووقیژەوە وتی: خۆ پێم وتن ئەوم خۆش ناوێ.

ئەفسەری یەکەم وتی: لەوانەیە مەترسیدار بێ.

کەشتیەوانەکە هاواری کرد: خۆیەتی! چەکێکی نهێنییە! خوایە گیان! هەر ئێستاکە پەیامێك بۆ شاژن بنێرن. وڵات دەبێ لە ئامادە باشی دابێ. دووربینەکەم بدەنێ.

ئەفسەری یەکەم دووربینەکەی دا بە کەشتیوانەکە و ئەویش بە چاوی خۆیەوە نا.

کەشتیەوانەکە هاواری کرد: هەموو شوێنێك پڕە لە باڵندە، ئاسمان پڕە لە باڵندە! کەس نازانێ ئەوانە خەریکی چین؟ سەبرکەن! کەمێك بوەستن! چەند

---

١١- Queen Mary ( مەلیك ماری)

کەسی لەسەرە. دەتوانم جوڵەکەیان ببینم! لەوێ یەك، یەك، واتا من ئەو نەفرەتیەم بە باشی رێك خستووە! لە مێرمنداڵێك دەچێ بە پانتۆڵێکی سێ چارەگەوە! بەڵێ بە جوانی دەیبینم کە مێرمنداڵێك بە پانتۆڵێکی سێ چارەگەوە لەو سەرەوە راوستاوە! لەوێ یەك، یەك، لەوێ یەك، یەك، یەك، جۆرێك خاڵخاڵۆکەی زەبەلاحە.

ئەفسەری یەکەم وتی: ئێستا کەمێك بیدە بە من، کەشتیەوان!

و کوللەیەکی سەوزی زەبەلاح!

ئەفسەری یەکەم بە توندی وتی: کەشتیەوان! کەشتیەوان! تکا دەکەم!

و جاڵجاڵۆکێکی زەبەلاح!

ئەفسەری دووەم بە هێواشی وتی: خوایە گیان، دیسان خواردوویەتیەوە.



کەشتیەوان هاواری کرد: هەزارپێیەکی زەبەلاح، بەراستی زەبەلاح!

ئەفسەری یەکەم وتی: بانگی دکتۆری کەشتیەکە بکەن، کەشتیەوانەکەمان حاڵی باش نییە.

خولەکێك دواتر، تۆپە گەورە و خڕەکە لە ناو هەورەکاندا بزر بوو، ئەوانەی لەسەر کەشتیەکە بوون هەرگیز نەیانتوانی بیبیننەوە.

## بیست و چوار

بەڵام لەسەر کۆخەکە، هەموو هەر خۆشحاڵ بوون.

کرمی خاکی وتی: نازانم ئەم جارەیان سەر لە کوێ دەردێنین.

ئەوان وتیان: چ بایەخێکی هەیە؟ هەمیشە باڵندە دەریایەکان درەنگ یا زوو دەگەڕێنەوە بۆ کەنار دەریا.

ئەوان بەرە بەرە بەرەو سەرتر دەڕۆیشتن، لەسەرەوەی بەرزترین هەور، کۆخەکە لە لایەکەوە بۆ لایەکی تر دەفڕی و بە ئارامی دەهات و دەچوو.

خاڵخاڵۆکە پرسی: بەڕای ئێوە ئێستا کاتێکی باش نییە بۆ ئاواز و مۆسیقا؟ پیرە کوللە ڕات چییە؟

کوللەی پیر کە لە کەمەریەوە دوولا هاتبۆوە، وەڵامی دایەوە: بە خۆشحاڵیەوە، خاتوونی بەڕێز!

هەموویان هاواریان کرد: ئاه، ئەهای، کوللە دەیەوێ ئاوازێکمان بۆ بژەنێ. و یەکسەر هەموویان لە دەورەی ژەنیاری سەوز کۆبوونەوە و کۆنسێرت دەستی پێکرد.

لەو چرکەساتەی کە یەکەم نۆتی مۆسیقا لێدرا، بیسەران بە تەواوی مات و بێدەنگ بوون. جیمز هەرگیز مۆسیقایەکی ئەوها خۆشی نەبیستبوو. لە ناو باغی ماڵەوە ئێوارانی هاوین، زۆر جار گوێ لە دەنگی ئەو کوللانە دەبوو، کە جیرە جیریان دەکرد، هەمیشە ئەو دەنگەی پێی خۆش بوو کە کوللەکان دەریان دێنا. بەڵام ئەمە شتێکی تر بوو، بەراستی مۆسیقا بوو، هەم نەواو رێکخراو و هەموو شتەکانی تری.

و کوللەی پیر سازێکی لەرادەبەدەر جوان و خۆشی دەژەنی. وەکو دەنگی کەمان وابوو! رێك لە ژەنینی کەمان دەچوو! قەوسی کەمانەکە، واتە ئەو بەشەی کە دەیجولێنن، پێیەکانی پشتەوەی بوو، ژێیەکانی کەمان، واتە ئەو بەشەی دەنگی لێ دەردەچێ، سەر لێوی باڵەکانی بوو.

تەنیا کەڵکی لەبەشی سەرەوەی رانەکانی وەردەگرت و سەر و خوارەوەی پێدەکرد و، بە شارەزایەکی لەرادەبەدەر لە سەر باڵەکانی دەخشاند. هەندێك جار بە ئارامی، هەندێك جاریش بە خێرایی، بەڵام هەموو کات هەر بە نەرمی. ئەوە رێك ئەو شێوەیە بوو کە کەمان ژەنێك بە شارەزاییەکی تەواو،

قەوسی کەمانەکەی بەکار دێنێ و ئاوازەکە دەخولقێنێ، ئاسمانی شینی دەوروبەری خۆیان پڕ کردبوو لەو ئاوازە سیحراوییە.

کاتێك بەشی یەکەم کۆتایی هات، هەموویان شێتانە چەپڵەیان لێدا خانمی جاڵجاڵۆکەش راوەستا و هاواری کرد: ئافەرین! دەستخۆش! کەمێکی تریش بژەنە!

کوللەی پیر بە جیمز پێکەنی و لێی پرسی: جیمز، پێت خۆش بوو؟

جیمز وەڵامی دایەوە: ئاە، عاشقی بووم! زۆر جوان بوو! رێك لەوە دەچوو کە کەمانێکی راستیت لە دەست دابێ!

کوللەی پیر هاواری کرد: کەمانێکی راستی! خوایە گیان، پێمخۆش بوو! کوڕی ئازیزم، من کەمانێکی راستیم! ئەوە بەشێکە لەجەستەم!

جیمز لێی پرسی: بەڵام ئایا هەموو کوللەکان وەکو تۆ کەمان دەژەنن؟

ئەو وەڵامی دایەوە: نا، هەموویان نا! ئەگەر دەتەوێ بزانی، من کوللەیەکی شاخ کورتم. دەبینی دوو شاخی کورت لەسەرم هاتۆنەتە دەر، ئالێرە. زۆر کورتن، وایە؟ لەبەر ئەوە بە شاخ کورت ناوم دەبەن، ئێمەی شاخ کورتیش تاکە کوللەیەکین کە قەوس بەکار دێنین تا وەك کەمان مۆسیقا بژەنین. خزم و کەسە شاخ درێژەکانم، ئەوانەی شاخی درێژ و خواریان هەیە، تەنیا بە لێك خشانی سەر باڵەکانیان مۆسیقا دەژەنن. ئەوان کەمان نین،

ئەوان باڵ لێکدەرن. لەوانەشە دەنگێکی تارادەیەك نزم دەربێنن، دەنگێك کە زیاتر لە بانجۆ دەچێ نەك کەمان.[١٢]

جیمز بە دەنگێکی بەرز وتی: هەمووی هەر سەرسوڕهێنەرە. تاکو ئێستا بیرم لەوە نەکردبۆوە، کە کوللە چۆن دەنگ دەردێنێ.

کوللەی پیر بە میهرەبانیەوە وتی: دۆستی گەنج و ئازیزم، لەم دونیایەی ئێمەدا زۆر شت هەیە، کە تۆ هێشتا بیرت لێ نەکردۆتەوە، بۆ نموونە بەڕای تۆ گوێیەکانی من لە کوێن؟

گوێیەکانت؟ ئاشکرایە بەسەرتەوەن.

هەموو دەستیان کرد بە پێکەنین.

هەزارپێ بە دەنگێکی بەرز وتی: مانای تۆ تەنانەت ئەمەش نازانی؟

کوللەی پیر زەردەخەنەیەکی بۆ جیمز کردو وتی: دیسان هەڵی بێنە.

مەحاڵە لە شوێنێکی تر بن.

ئاخ، نابێ؟

باشە، ئەوە باوەڕم کرد، لە کوێن؟

کوللەی پیر وتی: ڕێك لێرە، لە هەردوو لای سکم.

نا، ئەوە ڕاست نییە.

---

١٢- جۆرە سازێکی ژێدارە

ئاشکرایە کە راستە. ئەوە کوێی سەیرە؟ پێویستە سیسرکەکانی ئامۆزام و کوللە شاخ درێژەکان ببینی، تا بزانی گوێیەکانیان لە کوێن.

لە کوێن؟

لەسەر پێیەکانیان. لەسەر دوو پێی پێشەوەیان، دروست لە بن ئەژنۆیان.

هەزارپێ بە توڕەییەوە وتی: واتە تۆ ئەوەشت نەدەزانی؟

جیمز وتی: گاڵتە دەکەی. مەحاڵە کەسێك گوێیەکانی لەسەر پێیەکانی بێ.

بۆچی مەحاڵە؟

چۆنکە... چۆنکە گاڵتە جاڕییە.

هەزارپێ کە وەك هەمیشە پێدەکەنی و ددانەکانی دەردەخست، وتی: دەزانی بەڕای من چ شتێك گاڵتە جاڕییە؟ ببورە، من پێموایە گاڵتە جاڕی ئەوەیە، کە مرۆڤ گوێیەکانی بە هەردوو لای سەرییەوە بێ. پێویستە رۆژێك بە هێواشی لە ئاوێنەدا سەیری خۆت بکەی.

کرمی خاکی هاواری کرد: هەی بەڵای پیس و چەپەڵ! تۆ بۆچی هەمیشە ئەوەندە بێ ئەدەبی و بە هەمووان رادەبوێری؟ دەبێ هەر ئێستا داوای لێبوردن لە جیمز بکەی.

# بیست و پێنج

جیمز نەیەویست کرمی خاکی و هەزارپێ دیسان بکەونە مشتومڕ، لەبەر ئەوە هەر زوو بە کرمی خاکی وت: با بزانم، تۆش ساز دەژەنی؟

کرمی خاکی کە خۆشحاڵ ببوو وتی: نا، بەڵام کاری تر ئەنجام دەدەم کە هەندێکیان بەراستی نائاساییین.

جیمز پرسی: وەك چی؟

کرمی خاکی وتی: باشە، جارێکی تر ئەگەر لە مەزرا یا لە باغێکدا راوەستای و سەیری دەوروبەری خۆت کرد، تەنیا ئەوەت لە بیر بێ کە: هەر تۆسقاڵە خاکێکی سەر زەوی، هەر پارچەیەکی بچووك کە بتوانی بیبینی، لەو چەند ساڵەدا بەناو جەستەی کرمێکی خاکی دا تێپەڕیوە! ئەوە زۆر نایاب نییە؟

جیمز وتی: ئەوە شتە مەحاڵە!

کوڕی ئازیزم، ئەوە راستە.

مەبەستت ئەوەیە تۆ بەراستی خاك دەخۆی؟

کرمی خاکی بە فیزەوە وتی: زۆر بە جوانی، لە سەرێکەوە دێتە ژوورەوە و لە لایەکەی تر دەچێتە دەرەوە.

بەڵام پرۆسەکە چییە؟

مەبەستت لە پرۆسە چییە؟

بۆچی ئەو کارە دەکەی؟

ئێمە ئەو کارە بۆ جوتیارەکان دەکەین. ئەو کارەی ئێمە خاکەکە سوك و تورت و نایاب دەکات، هەر لەبەر ئەوەیە شتەکان لە ناو خاکدا باشتر گەشە دەکەن. ئەگەر بەراستی بتەوێ بزانی، جوتیارەکان بە بێ ئێمە ناتوانن کار بکەن. ئێمە پێویستین. ئێمە زۆر پێویستن. هەر بۆیە زۆر ئاساییە جوتیارەکان ئێمەیان خۆشبوێ. بەڕای من ئێمەیان لە خاڵخاڵۆکەش خۆشتر دەوێ.

جیمز ئاوڕی دایەوە تا سەیری خاڵخاڵۆکە بکات، دواتر وتی: خاڵخاڵۆکە! ئایا جوتیارەکان تۆشیان خۆشدەوێ؟

خاڵخاڵۆکە بە فیزێکەوە، لە کاتێکدا لە شەرمان سوور هەڵگەڕابوو، وەڵامی دایەوە: پێیان وتووم کە خۆشیان دەوێین. لەراستیدا من تێگەیشتووم جوتیارەکان لە هەندێك شوێندا ئەوندەیان ئێمە خۆش دەوێ، بە جۆرێك دەڕۆن و کیسەیەك خاڵخاڵۆکەی زیندو دەکرن ودەیان هێننەوە ماڵێ و، دواتر لە ناو مەزرادا بەرەڵایان دەکەن. زۆر خۆشحاڵ دەبن، کە خاڵخاڵۆکەی زۆر لە مەزراکەیاندا هەبێ.

جیمز پرسی: بەڵام بۆچی؟

چونکە ئێمە هەموو ئەو مێش و مەگەزە پیسانە دەخۆین، کە زیان بە بەروبومی جوتیارەکان دەگەیەنن. ئەم کارە زۆر یارمەتیدەرە و، هیچ پارەیەکیش سەبارەت بەو خزمەتەمان وەرناگرین.

جیمز پێیوت: کەواتە ئێوە لەرادەبەدەر بەکەڵکن. دەکرێ پرسیارێکی تایبەتیت لێ بپرسم؟

تکایە فەرموو:

باشە، ئایا راستە، دەکرێ تەمەنی خاڵخاڵۆکە لە رووی ژمارەی خاڵەکانیەوە بزانین؟

خاڵخاڵۆکە وتی: نا، ئەوە تەنیا چیرۆکێکی منداڵانەیە. ژمارەی خاڵەکانی ئێمە هیچ کات ناگۆڕێ. هەندێکمان بە خاڵی زیاتر دێنە دنیاوە بەڵام ژمارەی خاڵەکانمان هیچ کات ناگۆڕێت. ژمارەی ئەو خاڵانەی خاڵخاڵۆکە هەیەتی، تەنیا نیشاندەری ئەوەیە کە سەر بە کام جۆرەیە. بۆ نموونە هەروەك بۆخۆت دەیبینی، من خاڵخاڵۆکەیێکی نۆ خاڵم. من زۆر بەختەوەرم. ئەوە جۆرێکی باشە.

جیمز سەیرێکی قاوغی سووری خاڵخاڵۆکە نۆ خاڵەکەی کردو وتی: بەراستی وایە.

خاڵخاڵۆکە بەردەوام بوو: لە لایەکی تر هەندێك لە خزمەکانمان کە شانسی کەمتریان هەبوو، پتر لە دوو خاڵ لەسەر قاوغەکەیان نییە! دەتوانی

وێنای بکەی؟ ئەوانە بە خاڵخاڵۆکەی دوو خاڵ بەناو بانگن و، بە داخەوە دەبێ بڵێم ئەوانە ژمارەیان زۆرە و رەوشتیان خراپە، هەروەها خاڵخاڵۆکەی پێنج خاڵیش هەیە. ئەوان زۆر باشترن لە دوو خاڵەکان. هەر چەند بەڕای من کەمێك بێ شەرمن.

جیمز وتی: وا دیارە هەموو ئەو کەسانەی لێرەن، خۆشەویستن، چەند خۆشە!

هەزارپێ بە خۆشحاڵیەوە هاواری کرد: من نا، من تەنیا بەڵایەکم و شانازیشی پێدەکەم! من بەڵایەکی ترسناکی قێزەونم!

کرمی خاکی وتی: ئافەرین! ئافەرین!

جیمز پرسی: خانمی جاڵجاڵۆکە، ئەی تۆ؟ ئایا تۆش لە دونیادا ئەوەندە خۆشەویستی؟

خانمی جاڵجاڵۆکە بە بڵندی ئاهێکی هەڵکێشا و وەڵامی دایەوە: نا، من لەگەڵ ئەوەشدا کاری باش ئەنجام دەدەم، هیچ خۆشەویست نیم. بە درێژایی رۆژ مێش و مەگەز بە تۆڕەکەم دەگرم. من بوونەوەرێکی خاوەن ئابڕووم.

جیمز وتی: دەزانم.

خانمی جاڵجاڵۆکە بەردەوام بوو: جۆری رەفتاری ئەوان لەگەڵ جاڵجاڵۆکە زۆر نادادپەروەرانەیە. هەر ئەو هەفتەی پێشوو، ئیسپانجی پورە

تۆقێنەرەکەت، باوکی ئازیزو بێ چارەمی لە کونی پلاکی کارەباوە، توڕدایە ناو وانی حەمامەوە.

جیمز هاواری کرد: ئاخ، چەند بە ئازارە!

خانمی جاڵجاڵۆکە لەبەر خۆیەوە وتی: من هەموو ئەو رووداوەم لە سەرەوە، لە گۆشەی سەقفەکەوە دەبینی. ترسناك بوو. ئێمە ئیتر باوکمان نەبینیەوە. فرمێسکێکی گەورە لە سەر روومەتی جاڵجاڵۆکە خزی و کەوتە خوارێ.

جیمز سەیری ئەوانی تری کردو وتی: بەڵام ئایا ئەوە زۆر خراپ نییە کە جاڵجاڵۆکەیەك بکوژی؟

هەزارپێ وتی: ئاشکرایە خراپە، لەوانەیە شومترین کار بێت کە کەسێك ئەنجامی دەدات. بینیت دوای ئەوەی پورە ئیسپانج ئەو کارەی کرد، چی بەسەر هات! ہم م م م...! هەموو هەستمان پێکرد، کە چۆن کۆخەکە پانی کردەوە. ئاخ! خانمی جاڵجاڵۆکە ئەو دەنگە دەبێ بۆ تۆ خۆش بووبێت!

خانمی جاڵجاڵۆکە وەڵامی دایەوە: زۆر خۆش بوو، دەتوانی ئاوازێکمان لەو بارەوە بۆ بڵێی؟

هەزارپێ ئەو کارەی کرد.

پورە ئیسپانجی کە هەمیشە لەبارەیەوە دەوێین،

زۆر ناقۆڵا و خڕو خوول بوو

لەرادەبەدەر شل و پل

ئەوپەڕی گێل و حۆل

سک و کەمەری وەکو هەویر شل بوو

لە شتە پیرۆزەکانی تری هەر مەپرسە

بە خۆی دەوت دەبێ وەك پشیلە خۆم ساف بکەم

ئەوەندە لاواز بم هەتا کەمەرم بە ناوکمەوە بنووسێ

بەلام لەناکا و کۆخەکە هات و

هەیکەلی پورە گیانی کرد بە ژێرەوە

بۆ هەمیشە لاوازتر کرد.

خانمی جالّجالّۆکە وتی: زۆر باش بوو، ئێستا لەمەڕ پورە ئیسپایکر ئاوازێکمان بۆ بلێ.

هەزارپێ بە پێکەنینەوە وتی: بەدڵ و بە گیان!

پورە ئیسپایکری ئێمە باریك و لاواز بوو

وەکو پارچە وەیارێك، ئێسقانی وشك و برینگ،

درێژو باریك، گەر بکرابا بلّندی بکەی

دەکرا بۆ خۆش کردنی ئاگر بە کاری بێنی

رۆژێکیان بە تورەییەوە وتی:

دەبێ کارێکی وا بکەم تا قەلّەو بم

من دەبێ چەوری بۆ خۆم پەیدا بکەم
بەردەوام بچم بۆ سەر تەرازوو
لێ گەڕێم هەر کیلۆیەکان بەسەر یەکدا زۆر بن
دەبێ هەموو جۆرە خواردنێك بخۆم
جۆرەها شیرینی، چکولیات
تا هەموو جەستەم وەکو بلۆق هەلاوسێ
من دەبێ تا سبەی بەیانی
هەیکەلم بە تەواوی بگۆڕم.
و کۆخەکە بە پێکەنینەوە وتی:
خۆم بە تەنیا هەیکەلەکەت بۆ رێك و پێك دەکەم.
و کۆخەکەش
پورە ئیسپایکری لاوازی لەسەر چیمەنەکان
ئوتو کردو خێرا رۆیشت!

هەموو چەپڵەیان لێداو داوایان لە هەزارپێ کرد دیسان ئاوازیان بۆ بخوێنێ. هەزارپێش یەکسەر دەستی کرد بە خوێندنی ئاوازی دڵخوازی خۆی:

رۆژێك بوو رۆژێك نەبوو
لەو قەدیمانە کەس دیار نەبوو
کە سەگولاوکەکانی ئەمڕۆ وەك بەراز بوون

مەیمونەکان شیلەی تەنباکۆیان دەخوارد
مریشکەکان لە خەودا بوون
هەموویان پرخەیان دەهات
دەنگی مراویەکان کواك ـ کواك
خواردنی ژیشکەیا کچی تاقانە
هەموو بزنەکان قامیشی شەکر دەخۆن
و دایکە هاباردی پیر
پێوەی نووسابوو ...
هەزارپێ ئاگاداربە، ئاگاداربە!

## بیست و شەش

هەزارپێ لە کاتی خوێندنی ئەو ئاوازەدا شێتانە بە دەورەی کۆخەکەدا سەمای دەکرد، لەناکاو لە لێواری کۆخەکە نزیك بۆوە و بۆ سێ چرکە نزیك لە مردن لەسەر لێواری هەڵدێرەکە خولایەوە، لاقی لێك دەئالاّ، تا خۆی لە هەڵدان لە هەوادا رزگار بکات و پێش ئەوەی کەس بیگاتێ، کەوتە خوارەوە! لە کاتی کەوتنە خوارەوەدا لە ترسان قیژاندی، ئەوانی تر گەیشتنە سەر لێواری کۆخەکە و سەیریان کرد، جەستەی درێژی ئەو بێ بەختە لە هەوادا و وردە وردە بچووك و بچووکتر دەبێتەوە تا لە چاو ونبوو.

جیمز هاواری کرد: کرمی ئاوریشم! زوو دەست بکە بە چنین!

کرمی ئاوریشم ئاهێکی هەڵکێشا، چونکە هێشتا ماندوویەتی چنینی ئەو داوانەی لەلەش دەرنەچووبوو، کە بۆ گرتنی باڵندە دەریایەکان بەکاریان هێنابوو، بەڵام هەمان کاری کرد کە داوای لێکرابوو.

هەرکە داوەکە لە کرمی ئاوریشم هاتە دەرەوە، جیمز پڕی دایە، لە دەوری کەمەری خۆی بەست و وتی: دەچمە خوارەوە تا بیدۆزمەوە. ئێوەش کرمی ئاوریشم بگرن، تا ئەویش لەگەڵ خۆم رانەکێشمە خوارەوە، دواتر ئەگەر سێ جار داوەکەم راکێشا، هەڵم کێشنە سەرەوە!

جیمز خۆی هەڵداو لە کاتێکدا جۆلانەی دەکرد بە دوای هەزارپێدا رۆیشتە خوارێ، خوارەوە، خوارەوە بۆ لای دەریای ژێر پێی، و ئێوەش دەتوانن بیهێنە بەرچاوی خۆتان کە کرمی ئاوریشم، ناچار بوو چەند بە خێرایی داوەکە بچنێ تا بە چوونە خوارەوەی جیمز رابگا.

خاڵخاڵۆکە وتی: ئێمە هیچ کامێکیان نابینینەوە. ئەی خوایە! ئەی خوایە! رێك لەو کاتەدا کە زۆر خۆشحاڵیین!

خانمی جاڵجاڵۆکە، گوڵە ئەستێرەکە و خاڵخاڵۆکە دەستیان کرد بە گریان. هەروەها کرمی خاکی، هاواری کرد:

من تۆسقاڵێکیش بیر لە هەزارپێ ناکەمەوە، بەڵام بەراستی ئەو کوڕە بچکۆلەم خۆش دەوێ.

کوللەی پیر بە کەمانەکەی، زۆر بە نەرمی دەستیکرد بە ژەنینی مۆسیقایەکی خەماوی، کە مۆسیقایەکە تەواو بوو، هەموویان تەنانەت خۆشی، بەخوڕ فرمێسکیان هەڵدەرشت.

لەناکاو سێ جار داوەکە راکێشرا. کوللەی پیر هاواری کرد: رایکێشن! هەمووتان بەدوای من دا، رایکێشن!

دەبوو نزیکەی یەك کیلۆمەتر داو رابکێشن، لەبەرئەوە هەموویان شێتانە لە هەوڵی ئەوەدا بوون، لە کۆتاییدا لەلابەلای کۆخەکەوە، هەزارپێ بەخۆی و چل و دوو دەست و پێ بە جیمزەوە نوسابوو، وەکو مشکی لە ئاو هەڵکێشراو، هەردووکیان دەرکەوتن.



هەزارپێ بە هەناسە بڕکێوە وتی: ئەو منی رزگار کرد! لە ناوەراستی زەریای ئەتڵەسی مەلەی کرد تا بمدۆزێتەوە.

کوللەی پیر دەستی لە پشتی جیمزی داو وتی: کوڕی ئازیزم! پیرۆزباییت لێ دەکەم.

هەزارپێ بە دەنگەوە وتی: پۆتینەکانم! سەیرکەن پۆتینە خۆشەویستەکانم! بە ئاوەکە خراپ بوون!

کرمی خاکی وتی: بێدەنگ بە! زۆر شانست هەیە کە هێشتا زیندووی.

جیمز پرسی: ئێمە هێشتا هەر دەڕۆینە سەرەوە؟

کوللەی پیر وەڵامی دایەوە: بەدڵنیاییەوە وایە. هەوا خەریکە تاریک دەبێ. دەزانم، هێندەی نەماوە شەو دابێ.

خانمی جاڵجالوکە پێشنیاری کرد: وەرن هەمووومان بڕۆینە خوارێ، بۆ ئەوەی تا سبەی بەیانی گەرماییمان تێدا بمێنێ.

کوللەی پیر وتی: نا، پێمواية ئەوە زۆر ژیرانە نییە، ئەگەر تەواوی شەو لە سەرەوە بمێنینەوەو ئاگادار بین، ئەمین ترە. ئەگەر شتێکیش روو بدات، ئەوا ئامادەین.

# بیست و حەوت

جیمز هێنری تراتر و هاوڕێیەکانی لەگەڵ تاریک بوونی هەوا، لەسەر کۆخەکە لە نزیك یەکتر هەڵتوتەکابوون. هەورەکان وەکو کێوە بەرز و بڵندەکان، گوماناوی، مەترسیدار و بەهێز لە هەموو شوێنێك بەسەر سەریانەوە بوون. هەوا وردە وردە تاریك و تاریکتر دەبوو، دواتر سێ بەشی مانگی زەرد هەڵگەڕاو لە ژێر هەورەکان هاتە دەرو تیشکێکی ترسناك کەوتە سەر هەموو دیمەنەکان. کۆخی زەبەلاح بە نەرمی لە لایەکەوە بۆ لایەکی تر جۆلانەی دەکرد و سەدان داوی سپی ئاوریشمی کە لە قونچکی کۆخەکەوە بە باڵندە دەریایەکانی سەریانەوە گرێ درابوون، لە ژێر تیشکی مانگە شەودا جوانیەکی بێ وێنەیان هەبوو.

دنیا کش و مات بوو. سەفەر کردن لەسەر کۆخێك هەرگیز لە سەفەر کردن بە فرۆکە ناچێ. فرۆکە دەنەڕێنێ و دەنگە دەنگی زۆر لە ئاسماندا دروست دەکات و بە نزیك بوونەوەی، ئەو بوونەوەرانەی کە لەوانەیە بە نهێنی لە ناو کێوە گەورە هەورەکاندا خۆیان حەشار دابێ، خۆیان دەشارنەوە. لەبەر ئەوە خەڵکانێك کە بە فرۆکە سەفەر دەکەن، هیچ کات، هیچ شتێك نابینن.

بەڵام كۆخ... ئاه بەڵێ ... كۆخ ئامێرێكی سەفەری نەرم و نهێنییە، كە هەرگیز لە كاتی فڕیندا دەنگی لێ نایەت، جیمز و هاوڕێیەكانی چەندین جار لە ماوەی ئەو شەوە بێدەنگ و دوور و درێژەدا، كاتێك لە سەر زەریا و بە ژێر تیشكی مانگە شەودا دەڕۆیشتن، شتی ئەوتۆیان بینی كە هیچ كەس پێشتر نەیبینی بوو.

جارێك كە بە بێ دەنگی بە ناو پەڵە هەورێكی سپیدا تێدەپەڕین، لەسەر پەڵە هەورەكە كۆمەڵێك شتی خڕ خڕ، و باڵا بەرز و سەیریان بینی، كە دوو ئەوەندەی باڵای مرۆڤێكی ئاسایی بوون، بەڵام هەر كە كۆخەكە لێیان نزیك بۆوە، دەركەوت كە ئەو شتانە بەراستی بوونەوەری زیندوون، بوونەوەری باڵا بەرز، توكن، وەك تارمایی، وەك سێبەر، سپی، كە وا دەهاتنە بەرچاو لە تێكەڵەی لۆكە، خوری و ریشاڵی سپی دروست كرابن.

خاڵخاڵۆكە وتی: ئۆووووو، من ئەم بار و دۆخەم پێخۆش نییە!

جیمز لەبەر خۆیەوە وتی: وسس س س! نابێ گوێیان لە دەنگی ئێمە بێ، رەنگە ئەمانە پیاوانی هەوری بن!

ئەوانەی لەسەر كۆخەكە بوون بۆ ئارامی خۆیان لە یەكتر نزیك ببونەوە، بە هێواشی وتیان: پیاوانی هەوری! خوایە گیان! خوایە گیان!

كرمی خاكی وتی: خۆشحاڵم كە كوێرم و هیچ نابینم، دەنا بەدڵنیاییەوە هاوارم دەكرد.

خانمی جالّجالّۆکە بە ئارامی وتی: هیوادارم نەگەڕێنەوە بمان بینن.

کرمی خاکی پرسی: پێتان وایە ئەوانە دەمانخۆن؟

هەزارپێ بە پێکەنینەوە وتی: ئەوان تۆ دەخۆن. وەك کالّباس قاش قاشت دەکەن و دەتخۆن.

کرمی خاکی داماو لە ترسان دەستی کرد بە لەرزین.

کوللەی پیر بە هێواشی وتی: ئەوانە چ کارێك دەکەن؟

جیمز بە نەرمی وەلاّمی دایەوە: نازانم، با سەیری بکەین و ببینین.

پیاوانی هەوری هەموویان لە گروپێکدا وەستابوون و، بە دەستەکانیان کارێکی تایبەتیان ئەنجام دەدا. سەرەتا دەستیان درێژ دەکرد(هەموویان لە یەك کاتدا) و مشتێك هەوریان هەلّدەگرت. دوایی ئەو مشتە هەوریان لە نێو پەنجەکانیاندا دەسوڕاند تا وەك گڕۆلّەیەکی گەورەی لێبێت. دواتر گڕۆلّەکەیان هەلّدەدایە گۆشەیەك و خێرا پارچە هەوری تریان هەلّدەگرت و دووبارە دەستیان پێدەکردەوە.

زۆر بێدەنگ و گوماناوی بوون. گڕۆلّەکانی تەنیشتیان بەرە بەرە زیاتر دەبوو. لە ماوەیەکی زۆر کەمدا بە ئەندازەی باری گەلابەیەکی لێ هات.

هەزارپێ وتی: بە دلّنیاییەوە ئەوانە شێتن! لێرە هیچ شتێك نییە تا لێی بترسین.

کرمی خاکی بە هێواشی وتی: بەڵای هیچ و پوچ، بێدەنگ بە، ئەگەر بمان بینن هەمووومان دەخۆن.

بەڵام پیاوانی هەوری ئەوەندە سەرقاڵی کارەکەیان بوون، کە ئاگاداری ئەو کۆخە زەبەلاحەی پشت سەریان نەبوون.

دواتر بینەرانی سەر کۆخەکە بینیان یەکێك لە پیاوانی هەوری، دەستە درێژە توکنەکەی بردە سەر سەری و گوێیان لێ بوو کە هاواری کرد: باشە منداڵینە! بەسە! بێڵەکان هەڵگرن! پیاوە هەوریەکانی تر خێرا بە دەنگێکی گەورە بە خۆشییەوە هاواریان کرد و دەستیان کرد بە هەڵبەزو دابەزو دەست راوەشاندن. بێڵە گەورەکانیان هەڵگرت و رۆیشتن بەرەو لای ئەو گرۆڵانەی دروستیان کردبوو، بە خێرایی دەستیان کرد بە راماڵینیان بەرەو ئاسمان. هاوکات بەیەکەوە ئاوازیان دەخوێند:

دەڕۆنە خوارێ!
دەڕۆنە خوارێ!
تەرزە و بەفر
سەهۆڵبەندان و پژمین و ئاوی لوت بەرێدەکەوێ!

جیمز بە خۆشیەوە لەبەر خۆیەوە وتی: ئەوانە تەرزەن! ئەوان خەریکی دروستکردنی تەرزە و بەفر بوون، ئێستاکەش هەڵیان دەدەنە خوارێ تا بەسەر خەڵکی ئەو دنیایەی خوارەوەدا بباریێ.

هەزارپێ وتی: تەرزە؟ بۆ مانایە! ئێستا هاوینە. خۆ هاوینان تەرزە ناباری.

جیمز پێی وت: ئەوانە کار بۆ هاوین دەکەن.

هەزارپێ دەنگی بەرز کردەوە و هاواری کرد: من بڕوا ناکەم!

ئەوانی تر بە هێواشی وتیان: وسس! جیمز بە ئارامی وتی: بیکە بۆ خاتری خوا، هەزارپێ ئەوەندە هات و هاوار مەکە.

هەزارپێ دەستی کرد بە پێکەنین و هاواری کرد: ئەو گێلانە گوێیان لە هیچ نییە، ئەوان وەکو دیوار کەڕن! سەیرکەن! پێش ئەوەی کەس بتوانێ پێشی بگرێ، دەستەکانی لە دەوری زاری داناو بە هەموو هێزییەوە بەسەر پیاوانی هەوریدا هاواری کرد:

نەزانینە! گەمژەینە! بێ مێشکینە! گێلینە! دەزانن چی دەکەن؟

دەنگەکەی بە خێرایی کاریگەر بوو. پیاوانی هەوری وەك ئەوەی کۆمەلێك زەرگەتە پێیانەوە دابن، لە جێی خۆیان دەرپەڕین و کاتێك کۆخە زەبەلاحەکەیان بینی کە لە دووری پەنجا مەترەوە بە ئاسماندا تێپەڕ دەبێ، هاوارێکی سەرسوڕهێنیان کرد و بێلەکانیان فڕێدا و بە بێ جوولە، وەك دەستەیەك هەیکەلی سپی و توکن ، راوەستان. تیشکی مانگەشە و هەیکەلەکەیانی رووناك کردبۆوە و لەو میوە زەبەلاحە ڕامابوون کە خەریکی فڕین بوو.

دانیشتوانی سەر کۆخەکە( جگە لە هەزارپێ)، بێ جووڵە و بە ترسەوە دانیشتبوون و سەیری پیاوە هەورییەکانیان دەکرد و نەیاندەزانی دواتر چی روویدەدا.

هەزارپێ هاواری کرد: من لێیان ناترسم! بۆ ئەوەی جارێکی بیسەلمێنێ کە ناترسێ، هەستایە سەرپێ و دەستی کرد بە سەما کردن و، بە هەر چل و دوو پێیەکانییەوە شتی سەیر و سەمەری بەرامبەر پیاوە هەوریەکان ئەنجام دەدا.

ئەو کارە بە تەواوی تورەی کردن. هەموو بە یەك جار سورانەوە و مشتێك تەرزەیان هەڵگرت و چوونە سەر لێواری هەوەرەکە و دەستیان کرد بە هاویشتنیان بۆ لای کۆخەکە و، بە درێژایی ئەو کاتە بە تورەییەوە دەیان قیژاند.

جیمز هاواری کرد: ئاگادار بن، خێرا لەسەر کۆخەکە درێژ بن ، خۆتان تەخت بکەن! باش بوو کە ئەو کارەیان کرد! تەرزەیەکی گەورە ئەگەر بە خێرایەکی تەواو بهاوێژرێت، دەتوانێ بە قەدەر یەك گاشە بەرد یا تۆپەلێك قورقوشم زیان بگەیەنێ. خوا دەزانێ پیاوە هەوریەکان چۆن دەیانهاویشت! تەرزەکان بە ناڵە ناڵەوە لە ئاسماندا وەکو گوللەی رەشاش دەهاویژران، جیمزیش گوێی لێ بوو کە بەر کۆخەکە دەکەوتن و بە دەنگێکی توندەوە دەچوونە ناو کۆخەکە، شلپ! شلپ! شلپ! بەر پشتی خاڵخاڵۆکەی بێ چارە دەکەوت چونکە نەیدەتوانی وەکو ئەوانی تر لەسەر کۆخەکە تەخت رابکشێ!

دواتر یەکێکیان ڕێك بەر لوتی هەزارپێ کەوت! و دووبارە یەکێکی تر بە شوێنێکی تری کەوت.

هاواری کرد: ئاخ! ئاخ! بەسە! بەسە!

بەڵام پیاوە هەوریەکان بە تەما نەبوون کۆتایی پێ بێنن. جیمز دەیبینی بە خێرایی بەسەر هەورەکانەوە ڕادەکەن و وەکو روحە توکنە زەبەلاحەکان تەرزەکانیان لەسەر تەپۆلکە تەرزەکان هەڵدەگرت و لەسەر لێواری هەورەکان و بە کۆخەکەیاندا دەکێشا. دووبارە رایان دەکرد تا تەرزەی تر بێنن و دوای ئەوەی هەموو تەرزەکان تەواو بوون، بە ئاسانی مشتێکیان هەوەر هەڵگرت ئەوەندەی کە پێویست بووکردیان بە گرۆڵە. بەڵام ئەمجارەی زۆر گەورەتر، هەندێکیان بە ئەندازەی گوللە تۆپ بوون.

جیمز هاواری کرد: خێرا! لە تونێلەکە بڕۆنە خوارێ ئەگینا هەموومان لە ناو دەچین!

هەموو بۆ لای دەرگای تونێلەکە رۆیشتن و دوای نیو چرکە هەموویان بە ساغ و سەلامەتی لە خوارەوە، لە ناو دەنکە کۆخەکە، لە ترسان هەڵدەلەرزین و گوێیان لە دەنگی ئەو تەرزانە دەگرت کە بەر دیواری کۆخەکە دەکەوتن.

هەزارپێ بە ناڵە ناڵەوە وتی: من مردم! هەموو گیانم بریندار بووە!

کرمی خاکی وتی: هەر ئەوەت قابیلە.

خاڵخاڵۆکە وتی: دەکرێ یەکێك پیاوەتیم لەگەڵ بکات پێم بڵێیت قاوخەکەم درزی داوە یان نا؟

کوللەی پیر هاواری کرد: ڕووناکاییمان بدەرێ!

گوڵەئەستێرەکە بە ناڵەوە وتی: ناتوانم! گلۆپەکەمیان شکاندووە!

هەزارپێ وتی: دەی یەکێکی تر دابنێ!

جیمز وتی: کەمێك بێدەنگ بن، گوێ بگرن! پێموایە چی تر پێمان دانادەن!

هەموو بیدەنگ بوون و گوێیان ڕاگرت. بەڵێ دەنگە دەنگەکە تەواو ببوو. تەرزەکان چی تر بەر کۆخەکە نەدەکەوتن.

ئێمە لێیان تێپەڕین.

بە دڵنیاییەوە باڵندە دەریایەکان ئێمەیان لە مەترسی دوور خستەوە.

ئەهای، با بڕۆینە سەرەوە و ببینین.

جیمز لە پێش هەمووواندا بە ترسەوە ڕۆیشتە سەرێ و ئەوانی تر دوا بە دوای ئەو لە تونێلەکە چوونە سەرەوە. جیمز سەری لە تونێلەکە بردە دەرەوە و سەیرێکی دەرەوبەری کرد. بانگی کرد: هیچ شتێك لە گۆڕێ نییە! لە هیچ شوێنێك نایان بینم!

## بیست و هەشت

ئەوانی تریش یەك بە دوای یەكدا هاتنە دەرەوە بۆ سەر كۆخەكە و، بە وردی سەیری دەوروبەری خۆیان كرد. مانگ هەر وەك جاران دەدرەوشایەوە و هێشتاش ژمارەیەكی زۆر كێوی هەوری بریقەدار لەملا و ئەولا دیاربوون. بەڵام هیچ پیاوێكی هەوری نەدەبینرا.

كوللەی پیر لە دیواری كۆخەكە ڕاماو هاواری كرد: كۆخەكە كێشەی بۆ دروست بووە، كون كون بووە و ئاو لە هەموو شوێنێكی دەچۆڕێتەوە!

كرمی خاكی هاواری كرد: كاری خۆی كرد! ئەگەر كۆخەكە كون بوو بێت بە دڵنیاییەوە دەخینكێین.

هەزارپێ پێیوت: ئەوەندە گەمژە مەبە! ئێمە خۆ لە ناو ئاو دانین!

خاڵخاڵۆكە هاواری كرد: ئاخ، سەیركەن! سەیركەن! سەیركەن! سەیركەن! لەوێ!

هەموو ئاوڕیان دایەوە تا سەیری بكەن.

ئێستا سەیرترین دیمەنیان لە دوورەوە، ڕێك لە پێش چاویان، دەبینی.

جۆرە کەوانێك بوو، شتێکی چەماوەی سەیر، کە دەگەیشتە ئاسمان و دووبارە لەهەر دوو سەرەکەیەوە دەهاتەوە خوارێ. دوو سەرەکەی لەسەر هەورێکی تەختی زۆر گەورە بوو، بە گەورەیی بیابانێك.

جیمز پرسی: ئەی خوایە گیان، ئەوە چییە؟

پردێکە!

یەك ئاڵقەی گەورە و زەبەلاحە کە نیوەیان لێ بڕیوە!

ناڵە ئەسپێکی زەبەلاحە کە سەراوبن کراوە!

هەزارپێ کە وەك گەچ سپی هەڵگەڕابوو، بە هێواشی وتی: ئەگەر هەڵەم پێم بڵێن، بەڵام ئایا ئەوانە پیاوانی هەوری نین لە هەموو شوێنێك بڵاو بوونەوە؟

بێدەنگیەکی کوشندە باڵی بەسەریاندا کێشا. کۆخەکە نزیك و نزیکتر بۆوە.

ئەوانە پیاوانی هەورین!

سەدان پیاوی هەوری!

چەند هەزار!

چەند ملوێن!

کرمی خاکی داماو قیژاندی: نامەوێ گوێم لێ بێت. بە قولابێکی ماسی گرتنەوە بم وەك تەڵە بۆ ڕاو کردنی ماسی و شتی تر بە کارم بێنن، پێم باشترە لەوەی ڕووبەڕووی ئەو بوونەوەرە ترسناکانە ببمەوە!

کوللەی پیر بە ناڵەوە وتی: مەکسیکییەك بە زیندویی سورم کاتەوەو بمخوا پێم خۆشترە!

جیمز بە هێواشی وتی: تکایە بێدەنگ بن، ئەوە تاکە هیوامانە.

ئەوان بە بێ جووڵە لەسەر کۆخەکە هەڵتوتەکابوون و چاویان لە پیاوانی هەورییەوە بڕیبوو. سەر هەورەکەیان پڕکردبوو، کەمێك سەرتر سەدان پیاوی هەوری تریش بەو کەوانە گەورە و گەمژەیەدا سەردەکەوتن.

خاڵخاڵۆکە بە هێواشی وتی: بەڵام ئەوە چییە؟ ئەوانە بە تەمان چ بەڵایەکمان بەسەر بێنن؟

هەزارپێ چوو بۆ لای زالکی تونێلەکە و ویستی بچێتە ژوورەوەو وتی: بۆ من گرنگ نییە ئەوانە خەریکی چین، لێرە نامێنمەوە! خوا حافیز!

بەڵام ئەوانی تر ئەوەندە ترسابوون، ڕەنگە لە ترسی ئەو مەسەلەیە لە جێی خۆیان ڕەق ببوون، نەیاندەتوانی بجووڵێنەوە.

جیمز بە هێواشی وتی: دەزانن چییە؟

ئەوان وتیان: چییە؟ چییە؟

ئەو کەوانە گەورەیە ـ وا بزانم خەریکن رەنگی دەکەن! ئەوان سەتڵە رەنگ و فڵچەی گەورەیان هەیە! سەیرکەن!

ئەو راستی دەکرد. کەسانی سەر کۆخەکە ئەوەندە لێی نزیك ببوونەوە، دەیانبینی ئەوە رێك ئەو کارە بوو کە پیاوانی هەوری دەیانکرد. هەموویان فڵچەی زۆر گەورەیان بە دەستەوە بوو، شێتانە رەنگەکەیان بە تاقی کەمانەکە دادەکرد. لەراستیدا ئەوەندە خێرا بوون، لە ماوەی چەند چرکەیەکدا کەوانەکە بە جوانترین و بەشکۆترین رەنگ داپۆشرا، سور، شین، سەوز، زەرد و مۆر.

هەموو بەیەکەوە وتیان: ئەوە پەلکە زێڕینەیە! ئەوان خەریکی دروست کردنی پەلکە زێڕینەن!

ئاخ، چەندە جوانە!

سەیری رەنگەکان بکەن!

هەموویان هاواریان کرد: هەزارپێ! وەرە سەرەوە و سەیرکە! ئەوان ئەوەندە عاشقی جوانی و دەروشانەوەی پەلکە زێڕینە ببوون، لە بیریان کرد نابێ دەنگیان بەرز بکەنەوە. هەزارپێ بە ترسەوە سەری لە زالکی تونێلەکەوە بردە دەرەوە و وتی: باش باش باش، من هەمیشە بیرم لەوە دەکردەوە، کە چۆن پەلکە زێڕینە دروست دەبێ! بەلام ئەو هەموو شریتە بۆچی؟ ئەوانە بەو شریتانە چی دەکەن؟

جیمز هاواری کرد: ئەی خوایە گیان، ئەوانە خەریکن دەیبەنە ژێر هەورەکان! پەلکە زێڕینە خەریکە دەڕوات! ئەوانە خەریکن بەو شریتە سەربەرەوخوار بۆ سەر زەوی دەنێرن!

هەزارپێ بە توندی وتی: شتێکی ترتان پێی بڵێم، ئەگەر زۆر هەڵە نەبم، بۆخۆمان خەریکین رێك بەر پەلکە زێڕینە دەکەوین!

کوللەی پیر هاواری کرد: خوایە گیان، راست دەکات!

پەلکە زێڕینە لە هەوای خوار هەورەکان هەڵواسرابوو. کۆخەکەش دروست لە ژێر هەوروکان بوو و بە خێرایەکی تا رادەیەك زۆرەوە رێك بۆ لای پەلکە زێڕینە دەچوو.

خانمی جاڵجاڵۆکە دووبارە دەست و پێیەکانی کۆ کردەوەو هاواری کرد: ئیتر کۆتاییمانە!

کرمی خاکی بە ناڵەوە وتی: من ئەو توانایەم نییە! پێم بڵێن چ شتێك روو دەدات؟

خاڵخاڵۆکە هاواری کرد: ئێمە وا خەریکە لێی تێپەڕ دەبین!

نا لێی تێپەڕ نابین!

بۆچی لێی تێپەڕ دەبین!

بەڵێ! بەڵێ! نا! ئەی خوایە گیان!

جیمز بە دەنگێکی بەرزەوە وتی: هەمووتان خۆتان بگرن و دانیشن! و لە ناکاو کۆخەکە زۆر بە توندی بەر سەرەوەی پەلکە زێڕینە کەوت. دوای ئەوە دەنگی ورد بوونێکی سەیر هات، پەلکە زێڕینەکە رێك لە ناوەراستەوە شکاو بوو بە دوو بەشی جیا لە یەکتر.

ئەو شتەی کە دواتر روویدا یەگجار ناخۆش بوو. ئەو شریتانەی کە پیاوانی هەوری بۆ هێنانە خوارەوەی پەلکە زێڕینە بەکاریان هێنابوو، لەو داوە ئاوریشمییانە ئالْقان، کە رایەڵکەی نێوان کۆخ و باڵندە دەریایەکان بوون! کۆخەکە گیری کردبوو! ترس و دڵەڕاوکێ لە ناو دانیشتوانی سەر کۆخەکە بلاو بۆوە. جیمز هێنری تراتر خێرا سەیری سەرەوەی کرد و بینی، لەسەر لێواری هەورەکەوە، چاوانی سەدان پیاوی هەوری تووڕە تێوەی راماون.

دەمو چاویان تارادەیەك بێ شێوە بوو چونکە بە موی درێژ و سپی داپۆشرابوو. نە لوت، نە زار، نە گوێ، نە چەناگە، تەنیا چاویان دەبینرا، دوو چاوی بچووك و رەش کە لە ژێر مووەکانەوە بە قینەوە سەیریان دەکردن.



دواتر ترسناکترین شت روویدا. پیاوێکی هەوری، بوونەوەرێکی توکنی زۆر گەورە، کە لانی کەم باڵای چوار مەتر دەبوو، لەناکاو لەسەر لێواری هەورەکەوە بازی دا و ویستی یەکێك لە داوە ئاوریشمەکانی کۆخەکە بگرێ. جیمز و دۆستەکانی بینیان لە هەوادا بەسەر سەریانەوە دەفڕێ، دەستەکانی هاتبوو پێشەوە تا نزیکترین داو بگرێ و، ئەوان بینیان داوەکەی گرت و بە دەستە و پێیەکانی توند خۆی بە داوەکەوە نووساند و، دواتر زۆر بە هێواشی بە داوەکەدا هاتە خوارێ.

خاڵخاڵۆکە هاورای کرد: ئەی خوایە! یارمەتیمان بدە! ئێمە رزگار بکە!

کوللەی پیر بە نالەوە وتی: ئەوە دێتە خوارێ تا بمان خوات. ڕاکەنە خوارەوە!

هەزارپێ وتی: ئەگەر وایە یەکەم جار کرمی خاکی بخۆ! من بە کەلکی خواردن نایەم. وەکو ماسی سپی پڕ لە چەقلم!

جیمز بە دەنگێکی بەرزەوە وتی: هەزارپێ، زووکە داوەکەی بجوو، ئەو داوەی پیاوە هەوریەکە پێیدا دێتە خوارێ!

هەزارپێ چوو بۆ لای قونچکی کۆخەکەو داوە ئاوریشمەکەی گرت و گازی لێ گرت. یەکسەر لەسەر سەریانەوە، یەکێك لە باڵندە دەریایەکان لەوانی تر جیا بۆوە و بە داوێکی درێژەوە کە بە ملیەوە هەڵواسرابوو، فڕی و دوورکەوتەوە، دروست لە کۆتایی داوەکە پیاوە هەوری و توکنە گەورەکە هەڵواسرابوو، هاواری دەکرد و بە توڕەییەوە نەفرەتی لێ دەکردن. لەو مانگەشەوەدا، لەو کاتەی جۆلانەی دەکرد بەرزترو بەرزتر دەبۆوە و جیمز هێنری تراتر بە خۆشحاڵیەوە سەیری دەکرد، وتی: ئەی خوایە گیان ئەو پیاوە هەورییە هیچ قورسایەکی نییە چونکە باڵندەیەکی دەریایی دەتوانێ بە ئاسانی رایبکێشێ! بە دڵنیاییەوە تەنیا خوری و هەوایە!

پیاوە هەوریەکانی تر بە بینینی برادەرەکەیان، کە بەو شێوەیە لێیان دوور دەکەوتەوە، ئەوەندە سەرسام بوون تێکڕای شریتەکانی ناو دەستیان بەرەڵا کرد، دواتریش پەلکە زێڕینە ڕۆیشتە خوارەوە، هەردوو نیوەکەی بەیەکەوە،

کەوتە سەر زەوی. ئەوە بوو بە هۆی ئازاد بوونی کۆخەکە و یەکسەر لە هەورە ترسناکان دوور کەوتەوە.

بەڵام دانیشتوانی سەر کۆخەکە هێشتا ئاسودە نەبوون. پیاوانی هەوری تورە دەرپەڕین و بە ناو هەورەکاندا دوایان کەوتن و بێ بەزەییانە هەر شتێکی خەراپ و رەقیان بەردەست کەوتبا پێیان دادەدان. تاوە گەورەو بچووکە بەتاڵەکان، هێلکەی بۆگەن، مشکی مردوو، شوشەی جێلی سەر، و هەر شتێکی ئەو بوونەوەرانە بەر دەستیان دەکەوت لەسەرەوە بە کۆخەکەیان دادەدا. پیاوێکی هەوری بە بیری داهات، بەرمیلێکی مۆری تۆخی بەسەر هەزار پێ دا رشت، کە راست لەسەر لێواری هەوەرەکە بوو.

هەزارپێ بە تورەییەوە قیژاندی: پێیەکانم! خەریکە هەموویان پێکەوە دەنووسێن! ناتوانم برۆم! مژۆلکم ناکرێنەوە! نابینم! سەیری پۆتینەکانم بکە! چۆن خەراپ بوون.

بەڵام لەو کاتەدا ئەوەندە سەرقاڵی دوورخستنەوەی ئەو شتانە بوون، کە پیاوانی هەوری دەیانهاویشت، ئاگایان لە هەزارپی نەبوو.

هەزارپێ زۆر بە هێواشی گریا: رەنگەکە خەریکە ویشك و رەق و توند دەبێ! ناتوانم پێیەکانم بجوولێنم! ناتوانم هیچ شوێنێکم بجولێنم.

کرمی خاکی وتی: هێشتاش دەتوانی زارت بجوولێنی و ئەوەش جێگەی داخە.

هەزارپێ بە دەنگێکی بەرز نالاندی و وتی: جیمز! تکایە یارمەتیم بدە! ڕەنگەکان لێکەوە! بیانتاشە! هەر کارێکی دەتوانی بیکە!

## بیست و نۆ

وا دیار بوو لەو کاتەی کە باڵندە دەریایەکان کۆخەکەیان لە هەوری پەلکە زێڕینە دوور خستبۆوە، ماوەیەکی زۆر تێپەڕی بەڵام لە کۆتاییدا ئەوان سەرکەوتن، دواتر هەموویان لە دەورەی هەزارپێی داماو کۆبوونەوە و دەستیان کرد بە مشت و مڕ و قسە کردن، لە بارەی باشترین ڕێگە بۆ پاککردنەوەی ئەو ڕەنگانەی بە هەزارپێیدا ڕژابوون.

بەراستی دیمەنێکی سەرنج ڕاکێش بوو. هەموو گیانی مۆر بوو و ئێستاکەش کە ڕەنگەگە بەرە بەرە ویشك و ڕەق دەبوو، ناچار بوو قیت دابنیشێ، وەك ئەوەی بە چیمەنتۆ داپۆشرابێ. هەموو چل ودوو پێیەکانی وەك پارچە تەلێك بۆ پێشەوە کۆ کرابونەوە. هەوڵی دەدا شتێك بڵێت بەڵام لێوەکانی نەدەجوولان. ئێستا تەنیا کارێك کە دەیتوانی بیکات ئەوە بوو، دەنگی بچووك بچووکی لە گەروی دەربێنێت.

کوللەی پیر چوو بۆ پێشەوەو بە وردی دەستی لە سکی دا. پرسی: بەڵام ئاخر چۆن دەبێ ئەوەندە خێرا وشك بووبێتەوە؟

جیمز وەڵامی دایەوە: ئەوە رەنگی پەلکە زێرینەیە. رەنگی پەلکە زێرینە زۆر بە خێرایی ویشك و رەق دەبێ.

خانمی جاڵجاڵۆکە رایگەیاند: رقم لە رەنگە. دەمترسێنێت. من دەخاتەوە یادی پورە ئیسپایکر، مەبەستم پورە ئیسپایکری کۆچ کردوویە. چونکە دوایین جار کە سەقفی مەتبەخەکەی رەنگ کرد، جاڵجاڵۆکەی داپیرەی ئازیز و داماوم، پێش ئەوەی رەنگەکە وشك بێتەوە، نەیزانی، بە سەریدا رۆیشت و بە قاچییەوە نووسا. بە درێژایی ئەو شەوە گوێم لە دەنگی بوو کە هاواری دەکرد و دەیوت: فریام کەون! فریام کەون! یارمەتیم بدەن! و زۆر بە ئازار بوو کە گوێم لە دەنگی دەبوو. بەڵام چیم لەدەست دەهات؟ هیچ. تا رۆژی دواتر کە رەنگەکە وشك بۆوە، هەموومان ڕامان کردە لای و ئارامان کردەوە و کەمێکمان خواردن دایە. لە وانەیە بڕوا نەکەن، شەش مانگ بەم شێوەیە ژیانی بەسەر برد، سەراوبن بە سەقفەکەوە هەڵواسرابوو، لە کاتێکدا لاقەکانی بۆ هەمیشە لە ناو رەنگەکەدا گیریان کردبوو. بەراستی ئەوها بوو. هەموو رۆژێ خواردنمان دەدایە. مێشی تازە گیراوی ناو تۆڕی جاڵجالوکەمان بۆ دەبرد. بەڵام دواتر لە بیست و شەشی ئاپریلی رابردوو، پورە ئیسپانج ـ مەبەستم پورە ئیسپانجی کۆچ کردوویە ـ لە ناکاو چاوی بە سەقفەکە کەوت داپیرەمی بینی و هاواری کرد: جاڵجالوکە! یەك جاڵجاڵۆکەی قێزەون! زووکە ماسیحە دەسك درێژەکەم بۆ بێنە! دواتر، ئاخ زۆر دڵتەزین بوو، ناتوانم بیری

لێ بکەمەوە... خانمی جاڵجاڵۆکە فرمێسکەکانی سڕیەوەو بە خەم و خەفەتەوە سەیری هەزارپێی کردو بە ئارامی وتی: بوونەوەری داماو، زۆر بە داخم بۆت.

کرمی خاکی بە خۆشحاڵیەوە وتی: ئەو رەنگە هەرگیز لێ نابێتەوە، هەزارپێیەکەمان ئیتر ناتوانێ خۆی بجووڵێنێ. دەبێتە هەیکەلیك و ئێمەش دەتوانین لە ناوەراستی چیمەنەکە دایبنێین و حەوزێکی بچووکیشی لەسەر دروست بکەین.

کوللەی پیر پێشنیاری کرد: دەکرێ وەکو مۆز توێکڵەکەی لێبکەینەوە.

خاڵخاڵۆکە وتی: یا سماتەی لێ بخەین.

کرمی خاکی لەوانەیە بۆ یەکەم جار لە ژیانیدا پێکەنیبێ و وتی: ئەگەر زمانی جولاَبا، ئەگەر بەراستی دەردێنێ، ئەو کات دەتوانین زمانی بگرین و رایکێشین، چونکە ئەگەر توند و قایم رایبکێشین، دەتوانین ئاوەژووی بکەینەوە و دەبێتە خاوەنی پێستێکی نوێ.

کاتێك ئەو پێشنیارە باشە دەکرا، ئەوانی تر بێدەنگ بوون و سەرنجیان دەدا.

جیمز بە ئارامی وتی: وابزانم، وابزانم ئەوە باشترین کارە ئێمە دەتوانین ئەنجامی بدەین... دواتر سەبری گرت و خێرا پرسی: ئەوە چییە؟ گوێم لە دەنگێك بوو! یەکێك هاواری کرد!

## سی

هەموو سەریان بڵند کردوو گوێیان ڕاگرت.

وسس! دووبارە دەنگەکە هاتەوە!

بەڵام دەنگەکە ئەوندە دوور بوو لێیان نەیاندەزانی دەڵێ چی.

خانمی جاڵجاڵۆکە وتی: پیاوێکی هەورییە! دەزانم پیاوێکی هەورییە. ئەوان دیسان بەدوامانەوەن.

کرمی خاکی وتی: دەنگەکە لەسەرەوە دێ! و هەموویان جگە لە هەزارپێ کە نەیدەتوانی بجووڵێ، لە ناکاو تەماشای سەرەوەیان کرد و، ئەوان وتیان: ئاخ! یارمەتیمان بدەن! ئەی خوایە ئەمجارەیان تووشبووین. چۆن ئەو شتەی ئێستاکە دەیان بینی، ڕێك لەسەر سەریانەوە دەسوڕاو دەهات و دەچوو، هەورێکی گەورەو ڕەش، شتێکی وەك هەورە تریشقە، زۆر مەترسیدار، هاواری دەکرد و دەینەڕاند، هەتا ئەو کاتەی تێوەی ڕامابوون. و دواتر، لەسەرەوەی هەورەکە، ئەو دەنگە دوورە دیسان هاتەوە، بەڵام ئەمجارەیان زۆر بڵند و ئاشکرابوو.

هاواری کرد: بەلوعەی ئاوەکان بکەنەوە! ئاوەکان بکەنەوە! ئاوەکان بکەنەوە.

سێ چرکەسات دواتر ژێر هەورەکە وەکو پاکەتێك شەقی بردووکرایەوە، دواتر ئاو هاتە خوارەوە!

ئەوانیش بینیان ئاوی لێ هەڵدەڕژێ، چونکە دیار بوو وەك دڵۆپە بارانی ئاسایی نییە. هەر لە دڵۆپە بارانیش نەدەچوو. تۆپەڵێکی رەقی ئاو وەکو دەریا یا یەك زەریای تەواو بوو، لە ئاسمانەوە بەسەریاندا هەڵدەڕژا. هاتە خوارەوە، خوارێ، و خوارێ و خوارێ، یەکەم جار بەر باڵندە دەریایەکان کەوت و دواتر بەر کۆخەکە، داماوەکانی سەرکۆخەکەش لە ترسان دەیان قیژاند، لێقەوما و بێ ئامانج دەسوڕانەوە تا شتێك بدۆزنەوەو بیگرن و خۆیانی پێ رابگرن، قونچکی کۆخەکە، داوە ئاوریشمەکان، ئیتر هەر شتێك با. لە تەواوی ئەو ماوەیەدا ئاوەکە بە هات و هاوارەوە بەسەریاندا دەڕژاو دەیکوتان و دەیشوشتن و دەیبردن، کۆخەکەی هەڵدەداو دەیسوڕاند و لولی دەداو ئەو لاو ئەو لای پێدەکرد، دروست وەك ئەوەی لە ژێر گەورەترین تاڤگەی دونیادا بی و، نەتوانی بێیتە دەرەوە، نەیاندەتوانی قسەش بکەن، نەیاندەتوانی ببینن. نەیاندەتوانی هەناسە هەڵبکێشن. جیمز هێنری تراتر شێتانە خۆی بە یەکێك لە داوە ئاوریشمەکانی کۆخەکەوە نووساندبوو، لەبەر خۆیەوە وتی: بە دڵنیاییەوە ئەوە کۆتایی هەموو شتێکە. بەڵام دواتر لەناکاو، لافاوەکە چۆنی دەست پێکرد بوو، ئاواش راوەستا. ئەوان رزگاریان بوو و تەواو بوو. باڵندە دەریایە سەرسوڕهێنەرەکان دروست بە ناوەراستی

گەردەلوولەکەدا فڕیبوون و بە سەلامەتی لە لایەکەی تری هاتبوونە دەرەوە. جارێکی تر کۆخە زەبەلاحەکە بە ئارامی لەو مانگەشەوەدا لە ئاسمانی پڕ لە رەمز و راز کەوتەوە فڕین.

کوللەی پیر لە ژێر ئەو ئاوە زۆرەوە خۆی کێشایە دەرێ و بە هەناسە بڕکێوە وتی: ئاو چۆتە ناو پێستمەوە. هەمیشە پێموابووە پێستم ئاوی تێناچێ بەڵام وا نییەو پڕ بووم لە ئاو!

هەزارپێ بە خۆشحاڵییەوە هاواری کرد: سەیرم کەن! سەیرم کەن! بە جوانی شۆراوم! رەنگەکان لێبوونەوە! دووبارە دەتوانم بجوڵێم!

کرمی خاکی وتی: ئەوە ناخۆشترین هەواڵ بوو کە دوای ئەو هەموو ماوەیە دەیبیسم.

هەزارپێ بە دەوری کۆخەکەدا سەمای دەکرد و لە هەوادا سەربەقولاتی دەدان و بە دەنگێکی بەرزەوە ئەو ئاوازانەی دەخوێند:

ئافەرین بۆ ئێوە

ئەی باو باران ئافەرین مەرحەباتان لێ بێت و سەدان هەزار جار ئافەرین

پێیەکانم بۆ رۆیشتن سارد نین و گەرمن هیچ ئازارێك لە ناو جەستەمدا نییە

ئەی دۆستان باشترین بەڵا، منم لەم دنیایەدا بەڵایەی زەبەلاح منم

من سەرسوڕهێنەرو جوان و خۆشم بەرو بووم لە رەگ و ریشە دەردێنم

کوللەی پیر وتی: ئاخ، بێدەنگ بە!

هەزارپێ بە دەنگێکی بەرز وتی: سەیری من بکەن!

لە نێو بەلایاندا سەربەستم بۆ خواردن هەمیشە ئامادەم

شوختێك و شین بوونەوەو خوێن نە زەوی دیتی و نە ئاسمان لەناو جەستەم

دوژمنەکانم خەیاڵیان خاوە پێیان وایە منیان لە خاك وەرپێچاوە

ئەگەر چی هەنگاوێکم مابوو بمرم بەلام ئەجەلم نەهاتبوو نەمردم

دوژمنەکانم هەزارپێیەکی تریان دەنارد بۆ دونیایەکی تر

## سی و یەك

خاڵخاڵۆکە وتی: نازانم بۆچی لەناکاو ئەوندە بە خێرایی دەڕۆین؟

جیمز وەلامی دایەوە: پێموا نییە باڵندە دەریایەکان ئێرەیان لەمە پێخۆشتر بێ. وابزانم دەیانەوێ بە زووترین کات لێرە دەرباز بن. لەو باوبارانە زۆر دەترسان کە تێیکەوتین.

باڵندە دەریایەکان توندترو توندتر دەفڕین، بە خێرایکی لە رادەبەدەر تێپەڕین و کۆخەکەشیان بە دوای خۆیاندا رادەکێشا. هەورەکان یەك بە دوای یەکدا بە تەنیشتیاندا تێپەڕ دەبوون. هەموویان لە ژێر تیشکی مانگەشەودا وەك روح سپی بوون. چەند جاری تر لە ماوەی شەودا، نەفەرەکان چاویان بە

پیاوانی هەوری کەوت کە لەسەر هەورەکان دەرۆیشتن و سیحرو جادوە چەپەڵەکانیان بە دونیای خوارەوە نیشان دەدا.

جارێك لە تەنیشت ئامێری دروست کردنی بەفرەکە تێپەڕین کە لە حاڵی کار کردندا بوو، پیاوانی هەوری دەسکەکەیان هەڵدەسوڕاند و کلۆ کلۆی بەفر لە رەحەتی سەرەوەی ئامێرەکە دەهاتە دەرەوە. تەپڵی گەورە گەورەیان بینی کە بۆ دروستکردنی دەنگی هەورە تریشقە بەکاریان دێنا و، پیاوانی هەوری توورە بە کوتکی درێژ لێیان رادەکێشا. کارگەی دروستکردنی سەهۆڵ و با و ئەو شوێنانەیان بینی، کە گێژەلوکە و شەپۆلەکانی ئاویان دروست دەکرد و وەردەچەرخان بەرەو زەوی بەڕێدەکران، جارێکیان لە قولایی چاڵی هەورێکی پڕ ئاو و گەورە، چاویان بە شتێك کەوت کە وێدەچوو شاری پیاوانی هەوری بێت، لە هەموو شوێنێکی ناو هەورەکە ئەشکەوت و زالکی ئەشکەوتەکان دەبینران، خاوخێزانی پیاوانی هەوری تاوەیان بەدەستەوە بوو، بە سەر ئاگردانی بچووك بچوکدا نوشتابوونەوە و، تۆپەڵە بەفرەکانیان بۆ پیاوەکانیان سوور دەکردەوە تا بۆ نانی ئێوارە بیانخۆن، سەدان منداڵی پیاوانی هەوری لەو ناوە خەریکی گەمە کردن بوون، بە پێکەنینەوە هاواریان دەکرد و بە عارەبانە بەفرینەکانیانەوە لەسەر هەورەکان دەخلیسکان.



کاتژمێرێك دواتر پێش هەڵاتنی رۆژ، دانیشتوانی سەر کۆخەکە گوێیان لە ویزە ویزێکی هێواش بوو، لە سەر سەریانەوە دەهات، کە سەیری سەرەوەی خۆیان کرد، بوونەوەرێکی خۆڵەمێشی زور گەورەی وەك شەمشەمە کوێرەیان بینی، بە قەڵەبازێك بەرو روویان هات. بە دەوری کۆخەکەدا سوڕایەوە و هەر دەسوڕایەوە، لە ژێر تیشکی مانگەشەودا باڵە گەورەکانی بە ئارامی دەهەژاند، کەمێك لە دانیشتوانی سەر کۆخەکە ڕاما، دواتر هەندێك دەنگی ناخۆشی لێوەهات و دووبارە لە تاریکیدا بزر بوو.

خانمی جالجالۆکە کە هەموو گیانی دەلەرزی، وتی: ئاخ، خوا بکەم زوو رۆژ بێتەوە!

جیمز وەڵامی دایەوە: زۆری پێناچێ، سەیرکەن، ئەو لایە خەریکە رووناک دەبێتەوە.

هەموو بێدەنگ بوون و سەیری خۆریان دەکرد، کە بە هێواشی لە لێواری ئاسۆوە دەهاتە سەرێ تا رۆژێکی نوێ دەست پێی بکات.

## سی و دوو

کاتێك کە هەوا بە تەواوی رووناك بۆوە، هەموویان بە پێوە وەستان و لاشەی وشك و داماویان بەدوای خۆیاندا رادەکێشا، دواتر هەزارپێ کە هەمیشە یەکەم کەس بوو شتەکانی دەبینی، هاواری کرد: بڕوانن، بڕوانن، خوارەوە وشکایەکی لێیە!

هەموویان ڕایان کردە سەر لێواری کۆخەکەو وتیان: راست دەکات! لە خۆشیان هاوارایان کرد!

وێدەچێ خانوو شەقام بن!

بەڵام چەند گەورەو زەبەلاحن!

شارێکی گەورە لە ژێر گزنگی خۆردا دەدرەوشێتەوە، هەزار مەتر لە خوار خۆیانەوە ئەو ناوەی داگرتووە. لەو بەرزایەوە، ئۆتۆمبێلەکان وەك سیسرکەیەکی

بچووك دەبینران، كە بە درێژایی جادەكان دەخزین، ئەو خەڵكەی بەسەر شۆستەكاندا دەڕۆیشتن، وەك تارمایی دووكەڵ دەهاتنە بەرچاو.

خاڵخاڵۆكە بە سەرسامیەوە رایگەیاند: بەڵام ئەو بینا گەورەو بە شكۆیانە! تا ئێستا ئەوانەم لە بەریتانیا نەبینیوە. بەڕای ئێوە ئەوە كام شارەیە؟

كوللەی پیر وتی: ناشێ ئێرە بەریتانیا بێت.

خانمی جالْجالۆكە پرسی: ئەدی كوێیە؟

جیمز كە لە خۆشیان هەدادانی نەبوو، هاواری كرد: دەزانن ئەو بینایانە چین؟ تاوەرە هەور بڕەكانن! كەوایە دەبێ ئێرە ئەمەریكا بێت. دۆستان، مانای ئەوەیە ئێمە بە درێژایی شەو بەسەر زەریای ئەتەلەسیدا تێپەڕیوین.

ئەوان هاواریان كرد: راست ناكەی!

مەحاڵە!

جێگەی بڕوا نییە! مەحاڵە بڕوا بەوە بكرێ!

هەزارپێ وتی: ئاخ، من هەمیشە خەونم بە چوونە ئەمریكاوە دەبینی! برادەرێكم هەبوو كە...

كرمی خاكی وتی: بێدەنگ بە. كێ بایەخ بە برادەرەكەت دەدات؟ ئەوی دەبێ ئێستا بیری لێ بكەینەوە ئەوەیە: كە ***چۆن دەتوانین بچینە خوارێ بۆ سەر زەوی؟***

خاڵخاڵۆكە وتی: لە جیمز بپرسە.

جیمز پێی وتن: پێموا نییە زۆر قورس و ناخۆش بێت. تەنیا دەبێ چەند داوێکی ئەو باڵندانە ببڕین تا ئازاد بن بەڵام زۆر نا، ئاگادار بن، تەنیا بە ئەندازەی پێویست، دەنا ئەوانی تر ناتوانن بە باشی لە هەوادا ڕامان بگرن. دواتر دەڕۆینە خوارێ ، هێواش و ئارام، تا دەگەینە سەر زەوی. هەزارپێ لە کاتی خۆیدا داوەکان دەقرتێنێ.

## سی و سێ

زۆر لە خوارەوەیان، لە شاری نیۆیۆرك بوو بەهەرا.

تۆپێکی گەورە بە ئەندازەی یەك خانوو دەبینرا، کە ڕێك لە ناوەندی ئاسمانی مانهاتان هەڵواسرابوو، بوو بەقاو کە ئەوە وڵاتێکی تر ناردویەتی، تا تەواوی شارەکە بتەقێنێتەوەو بیکاتە خۆڵە مێش. زەنگی مەترسی هێرشی هەوایی لە هەموو دەڤەرەکان بەرز بۆوە. هەموو بەرنامەکانی رادیۆ و تەلەفزیۆن پچران، تا رایگەیەنن خەڵکەکە دەبێ یەکسەر بچنە ژێر زەمینەکان. یەك ملیۆن مرۆڤ کە لە سەر شەقامەکان دەڕۆیشتن تا بچنە سەر کارەکانیان، تەماشای ئاسمانیان دەکرد، کە بینیان دێوەزمەیەك لەسەر سەریانەوە هەڵواسراوە، دەستیان کرد بە ڕاکردن بۆ لای نزیکترین زالکی میترۆ تا پەناگەیەکی باش بدۆزنەوە.

ئەفسەرکان تەلەفۆنەکانیان بە دەستەوە گرت و ناوی هەر کارمەندیکیان بە بیر داهاتبا، بە توندی فەرمانیان پێی دەکرد. بەڕێوەبەری شارەوانی تەلەفۆنی بۆ سەرۆك کۆماری ویلایەتە یەکگرتووەکان کرد لە **واشینگتۆن دی . سی**، تا داوای یارمەتی لیّ بکات، سەرۆك کۆمار کە بە جل و بەرگی ناومالّەوە خەریکی خواردنی نانی بەیانی بوو، یەکسەر قاپە چیپسە شیرنەکەی وەلانا کە نیوەی خواردبوو، دوگمەکانی راست و چەپی خۆی فشار دا تا ئەفسەرەکان و کەشتیەوانەکانی خۆی بانگهێشت بکات. لە سەرتاسەری ئەمریکا لە هەر پەنجا ویلایەتەکەی، لە ئالاسکاوە تا فلۆریداو لە پنسلڤانیاوە تا هاوایی، زەنگی مەترسی لیّدرا و بوو بە دەنگۆ کە گەورەترین بۆمب لە مێژووی جیهاندا لەسەر ئاسمانی شاری نیۆیۆرك بە حەواوە هەلّواسراوە و، هەر چرکەساتێك ئەگەری بەر بوونەوەی هەیە.

## سی و چوار

جیمز فەرمانی کرد: زووکە هەزارپیّ، یەکەم داو بپسێنە.

هەزارپیّ گازی لە یەکێك لە داوە ئاوریشمەکان گرت و، بالّندەیەکی دەریایی تر لە پۆلە بالّندەکە جیا بۆوە و، بە ریّگای خۆیدا رۆیشت و لەوانی تر دوور کەوتەوە.( بەلاّم ئەمجارەیان هیچ پیاوێکی هەوری تورە بە سەری داوەکەوە هەلّناوەسرابوو).

جیمز فەرمانی کرد: یەکێکی تر بقرتێنە.

هەزارپێ گازی لە داوێکی تر گرت.

بۆچی ناڕۆینە خوارێ؟

خەریکە دەڕۆینە خوارێ.

نا، ناڕۆیین.

جیمز پێیوتن: لەبیرتان نەچێ، کۆخەکە ئێستا زۆر سووکترە لەو کاتەی دەستمان کرد بە فڕین، ئەو هەموو ئاوەی تەرزەکانی لە دەست دا. هەزارپێ، دوو باڵندەی تر ئازاد بکە.

ئاخ، باشتر بوو!

ئەوە دەڕۆیین!

ئێستاکە بەراستی دەڕۆینە خوارێ!

بەڵێ، زۆر باشە! هەزارپێ ئیتر مەبڕە دەنا زۆر بە خێرایی دەکەوینە خوارەوە! دەبێ بە ئارامی بەرەو پێش بڕۆین.

کۆخە گەورەکە، هێواش هێواش بەرزییەکەی کەم بۆوە و بیناکان و جادەکانی خوارەوە نزیک نزیکتر دەبوونەوە.

خاڵخالۆکە پرسی: پێتان وایە کاتێك دەڕۆینە خوارێ، وێنەکەمان لە رۆژنامەکاندا نیشان دەدەن؟

هەزارپێ وتی: خوایە گیان، لە بیرم چوو پوتینەکانم وەبریقە بخەم. هەمووتان دەبێ یارمەتیم بدەن تا پێش ئەوەی بگەین بریقەیان هەبێ!

کرمی خاکی وتی: بیکە بۆ خاتری خوا! ناکرێ واز لەو شتانە بێ ....

بەڵام قسەکەی تەواو نەبوو کە لەناکاو... ویژژژژژژژژ! سەیری سەرەوەیان کرد و بینیان، فرۆکەیەکی گەورەی چوار مۆتۆڕی لە نزیك هەورەکانەوە هات و، بە خێرایەکی زۆرەوە بە دووری کەمتر لە حەوت مەتر لە سەر سەریانەوە تێپەڕی. لەراستیدا ئەوە فرۆکەیەکی نەفەر هەڵگری سەر لە بەیانی ئاسایی بوو، کە لە شیکاگۆوە هاتبوو بۆ نیۆیۆرك و هەر کە تێپەڕی، هەزار پێ یەك بە یەك داوە ئاوریشمەکانی قرتاند و باڵندە دەریاییەکان ئازاد بوون، کۆخە زەبەلاحەکە کە ئیتر هیچ شتێك نەبوو تا لە هەوادا ڕایبگرێ، وەکو پارچە قورقوشمێك بە خێرایی بەرەو زەوی بەربۆوە.

هەزارپێ هاواری کرد: یارمەتی!

خانمی جاڵجاڵۆکە هاواری کرد: رزگارمان کەن!

خاڵخاڵۆکە هاواری کرد: ئیتر لە ناو چووین!

کوللەی پیر هاواری کرد: کۆتایی ژیانمانە!

کرمی خاکی قیژاندی: جیمز! کارێك بکە! زووکە شتێك بکە!

جیمز هاواری کرد: ناتوانم، بەداخەوەم! خواحافیز! هەمووتان چاوتان بنوقێنن! زۆر ناخایەنێ!

# سی و پێنج

کاتێك کۆخەکە بۆ لای زەوی دەهاتە خوارەوە، دەسوڕایەوە و سەرەوبن دەبوو، هەموویان بە نائومێدی بە کلکی کۆخەکەوە نووسابوون تا خۆیان لە توڕدان بپارێزن.

کۆخەکە توندتر و توندتر دەرۆیشتە خوارێ وخوار و خوارتر، نزیکترو نزیکتر لە خانوو و شەقامەکانی ژێرەوە ، کاتێك بەر زەوی دەکەوت، بە دڵنیاییەوە دەبوو بە یەك ملیۆن پارچەی ورد ورد. لە شەقامی پێنەجم و شەقامی مەدیسۆن و تێکڕای شەقامەکانی تری شار، خەڵکانێك کە هێشتا نەگەیشتبوونە پەناگەکان، تەماشای سەرەوەیان کرد و بینیان کۆخێك خەریکە دێتە خوارەوە، وازیان لە ڕاکردن هێناو وەستان، لەو شتە رامان کە پێیان وابوو گەورەترین بۆمبی جیهانە و لە ئاسمانەوە بەسەریاندا دەکەوێ. چەند ژن قیژاندیان. ئەوانی تر لەسەر شۆستەکان چۆکیان دادا و بە دەنگێکی بەرز دەستیان کرد بە نزا و پاڕانەوە. پیاوە بەهێزەکان روویان لە یەکتر کردو شتێکیان وت. وەك: جو! وابزانم ئەوە بوو! و خوا حافیز لە هەمووتان، خوا حافیز! و بۆ سێ چرکە هەموو دانیشتوانی شار هەناسەی خۆیان راگرتبوو و چاوەڕوانی کۆتایی کارەکە بوو.

# سی و شەش

جیمز بە هەناسە بڕکێوە کە خۆی بە کلکی کۆخەکەوە نووساندبوو وتی: خوا حافیز خاڵخاڵۆکە، خوا حافیز هەزارپێ، خوا حافیز لە هەمووتان! پتر لە چەند چرکە نەمابوو، وا دیار بوو ڕێك بەر ناوەراستی ئەو بینا گەورانە دەکەوێ. جیمز دەیتوانی بینا هەور بڕەکان ببینێ، کە بە خێرایەکی ترسناکەوە بەرەو رووی دەهات و سەربانی زۆربەیان ساف و چوار گۆشە بوو، بەڵام بەرزترینیان نوکێکی باریك و درێژ و تیژی هەبوو، وەك دەرزیەکی زیوی زەبەلاح کە بە ئاسمانەوە نووسابێ.

ڕێك کۆخەکە بەربۆوە سەر ئەو دەرزیە!

زرمەی کەوتن هات: دەرزیەکە تا بنکەی کۆخەکە ڕۆچوو، لە ناکاو کۆخە زەبەلاحەکە گیرسایەوە و، بە بەرزترین شوێنی بینای **ئیمپایرستی** یەوە دروا.

## سی و حەوت

بەراستی دیمەنێکی سەرسوڕهێنەر بوو، دوو سێ خولەك دواتر هەر كە خەڵكەكە تێگەیشتن ئەوە بۆمب نییە، لە پەناگە و میترۆیەكان هاتنە دەرەوە تا سەیری ئەو موعجیزەیە بكەن. شەقامەكانی دەورەی بینایەكە تا نیو كیلۆمەتر دوور پڕ بوون لە ژن و پیاو، كاتێك ئەو دەنگۆیە بڵاو بۆوە كە بەراستی بوونەوەری زیندوو لەسەر تۆپە خڕو گەورەكە دێن و دەچن، هەموویان سەرسام بوون.

هاواریان كرد: كەشتی ئاسمانییە( یۆفۆ)!

ئەوانە لە فەزاوە هاتوون!

ئەوانە پیاوانی بەفرین!

لەوانەشە لە سەر مانگەوە هاتووبن!

و پیاوێك كە كامێرەیەكی بە چاویەوە بوو، وتی: من پێتان دەڵێم، ئەوانە زۆۆۆۆ... ر بە لامەوە سەیرن.

ئۆتۆمبێلەكانی پۆلیس و كارمەندانی ئاگر كوژێنەوە، لە هەموو شوێنێكی شارەكەوە بە دەنگی ئاگاداركردنەوەكەوە هاتن و، لە دەرەوەی بینای ئیمپایر سیتی راوەستان. دووسەت كارمەندی ئاگر كوژێنەوە و

شەشسەت پۆلیس هێرشیان بردە ناو بینایەکە و، تا ئەو شوێنەی دەیانتوانی بە باڵابەرەکاندا چوونە سەرێ، دواتر هەڵیان کوتایە ئەو سەربانەی خەڵکەکە تێیەوە رامابوون، ئەو شوێنەی گەشتیارەکان لێی رادەوەستن، رێك لە خوارستونە گەورەکە.

هەموو پۆلیسەکان چەکەکانیان ئامادە کرد و پەنجەیان لەسەر پەلاپیتکە و ئاگرکوژێنەوەکانیش تەورەکانیان توند بەدەستەوە گرتبوو. بەڵام ئەو شوێنەی لێی راوەستابوون، تا رادەیەك لە ژێر کۆخەکە بوو، نەیاندەتوانی بە باشی کەسانی سەر کۆخەکە ببینن.

بەڕێوەبەری پۆلیسەکان هاواری کرد: ئەهای ئێوە! وەرنە خوارێ و خۆتان نیشان بدەن! لەناکاو سەرە گەورەو قاوەیەکەی هەزارپێ لەسەر کۆخەکە بەدیار کەوت. چاوە رەشەکانی کە بە گەورەیی و خڕی دوو گوللە بوو، لە پۆلیسەکان و کارمەندەکانی ئاگر کوژێنەوەی خوارەوە ڕامابوو. دواتر زەردەخەنەیەك سیما ناشیرینەکەی داگرت.

پۆلیسەکان و کارمەندانی ئاگر کوژێنەوە، هەموویان بە یەکەوە هاواریان کرد: ئاگادار بن! یەك ئەژدیهایە!

ئەژدیها نییە، هەشت پێیەکی خوێن خۆرە!

گورگۆنە![13]

سی سێرپێنتە![14]

پراگە![15]

مەنتیکۆرە![16]

سێ کارمەندی ئاگر کوژێنەوە و پێنج پۆلیس بێهۆش بوون و ناچار بوون دووریان بخەنەوە.

بەڕێوەبەری پۆلیس هاواری کرد: یەك سنۆزۆنگێرە![17]

بەڕێوەبەری ئاگر کوژێنەوەکان هاواری کرد: یەك وەنگ دۆدڵە![18]

هەزارپێ هێشتا هەر پێدەکەنی. وا دیار بوو لەو هەراو هوریایەی دروستی کردبوو، زۆر دڵخۆش بوو.

١٣- Gorgonیەکێك لە سێ خوشکەکانی ئوستورەکانی یۆنانی کە لە جیاتی موو، ماری لەسەر بوو و بە نیگایەکی مرۆڤ دەبوو بە بەرد.

١٤- sea- serpent ماری دەریایی ئەفسانەییە( کە بە نیگایەکەی مرۆڤ دەبێتە بەرد و دەیکوژێ)

١٥- prock جۆرە دێوەزمەیەکە

١٦- Manticore دێوەزمەیەکی ئەفسانەیی، سەرەکەی مرۆڤەو، لەشی شێرو کلکی هەژدیهایە.

١٧- Snozzwanger دێوەزمەیەکی تووڕەی دەریاییە

١٨- Whangdoole جۆرە ئەژدیهایەکە.

بەڕێوەبەری پۆلیس دەستی بە دەورەی دەمییەوە گرت و هاواری کرد: سەیری ئێرە بکە! گوێم لێ بگرە! دەمەوێ بەراستی پێم بڵێی لە کوێوە هاتووی!

هەزارپێ لە کاتێکدا پتر لەجاران پێدەکەنی و ددانە قاوەیەکانی نیشان دەدان، بە هاوارەوە وەڵامی دایەوە: ئێمە لە هەزاران کیلۆمەتر بەولاترەوە هاتووین!

بەڕێوەبەری پۆلیس بانگی کرد: فەرموو! خۆ بە ئێوەم وت ئەوانە لە مەریخەوە هاتوون!

بەڕێوەبەری گروپی ئاگرکوژێنەوە وتی: وابزانم تۆ ڕاست دەکەی!

لەو کاتەدا، کوللەی پیر سەرە گەورە و سەوزەکەی لەسەر کۆخەکە بەرز کردەوە و سەری بردە تەنیشت سەری هەزارپێ. شەش پیاوی بەهێزی تر کە چاویان پێکەوت، بێهۆش بوون.

بەڕێوەبەری گروپی ئاگر کوژێنەوە قیژاندی: ئەو یەکە ئوینکە،[19] من دڵنیام ئەوە ئوینکە!

بەڕێوەبەری پۆلیس هاواری کرد: یان یەك کاکاتریسە![20] ، بکشێنەوە دواوە! هەر دەم لەوانەیە خۆی هەڵداتە سەر سەرمان!

---

19 -Oink

٢٠- Cockatrice ماری دەریایی کە لە هێلکە دێتە دەر، دەتوانێ بە نیگایەکەی مرۆڤ بکوژێ.

کوللەی پیر بە هەزارپێی وت: دەزانی ئەوانە لە بارەی چیدا دەدوێن؟

هەزارپێ وەڵامی دایەوە: چییت پێ باشە بیڵێ، بەڵام وادیارە ئەوانە بە هۆی شتێکەوە زۆر نیگەران و شڵەژاون.

دواتر سەری کوشندەو رەش و گەورەی خانمی جاڵجاڵۆکە، لە وانەیە لەبەر چاوی غەریبەیەك لە هەمووان ترسناکتر بێ، لە تەنیشت سەری پیرەکوللەوە دەرکەوت.

بەڕێوەبەری گروپی ئاگرکوژێنەوە هاواری کرد: هەر ئەوەمان کەم بوو! ئیتر کۆتاییمان هات. دووپشکی زەبەلاح!

بەڕێوەبەری پۆلیس هاواری کرد: لەویش خراپترە. جۆرە دێوەزمەیەکی مشەخۆری ژەهراوییە. ئاخ، تەنیا سەیری ئەو سەر و سەکوتە ترسێنەر و ژەهراوییەی بکەن!

بەڕێوەبەری گروپی ئاگرکوژێنەوەکان کە وەکو گەچ سپی هەڵگەڕابوو، پرسی: لەو جۆرەیە کە بۆ نانی بەیانی زەلامێك بە تەواوی دەخوات؟
بەڕێوەبەری پۆلیس وەڵامی دایەوە: بەڵێ، بە داخەوە لەو جۆرەیە!

خانمی جاڵجاڵۆکە بە دەنگێکی بەرزەوە وتی: ئاخ، تو خوا بۆچی هیچ کەس یارمەتیمان نادات تا لێرە بێینە خوارەوە؟ سەرم لە گێژەوە دێت.

بەڕێوەبەری گروپی ئاگرکوژێنەوەکان وتی: ئەوە فێڵە! تا من نەڵێم هیچ کەسێك نەجووڵێت.

بەڕێوەبەری پۆلیس لەبەرخۆیەوە وتی: ئەوانە بە دڵنیاییەوە چەکی فەزاییان پێیە!

بەڕێوەبەری گروپی ئاگرکوژێنەوەکان بە جیدی رایگەیاند: ***بەڵام پێویستە ئێمە کارێك هەر بکەین!*** چونکە نزیکەی پێنج ملیۆن کەس لەو خوارەوەی لە ناو شەقامەکاندا راوەستاون و سەیرمان دەکەن.

بەڕێوەبەری پۆلیس لێی پرسی: ئەی بۆچی پەیژەیەك دانانێی؟ من لەو خوارەوە رادەوەستم و پەیژەکە قایم دەگرم تا تۆ سەردەکەوی بزانی چ خەبەرە؟

بەڕێوەبەری گروپی ئاگرکوژێنەوەکان بە دەنگێکی توندو ناخۆشەوە وتی: زۆر سپاس!

حەوت سەر و سەکوتی سەرسورهێنەر لەسەر کۆخەکەوە سەیری خوارەوەیان دەکرد.

دەمو چاوی هەزارپێ، پیرەکوللە، خانمی جاڵجاڵۆکە، کرمی خاکی، خاڵخاڵۆکە، کرمی ئاوریشم و کرمی گوڵەئەستێرەکە. جۆرە ترس و دڵەراوکەیەك پۆلیس و ئاگرکوژێنەوەکانی سەر بانەکەی داگرت...

دواتر یەکسەر ترسەکەیان رەویەوە و لە سەرسامیان هەناسەیان لە سنگیاندا راگرت، چونکە مێرمنداڵێك دەبینرا کە لە تەنیشت بوونەوەرەکانی

تر راوەستابوو، با مووەکانی سەری دەجولاند، پێدەکەنی و دەستی رادەوەشاند و بانگی دەکردن: سڵاو لە هەمووتان! سڵاو!

ئەو پیاوانەی لە خوارەوە وەستان بوون بۆ چەند خولەکێك گێژو حۆل بوون. نەیاندەتوانی ئەوەی دەیبینن، بڕوای پێبکەن.

بەڕێوەبەری گروپی ئاگرکوژێنەوەکان کە سوور هەڵگەڕابوو، هاواری کرد: ئەی خوایە گیان، بەراستی ئەوە مێرمنداڵێکە، مەگەر نا؟

جیمز بانگی کردن: تکایە لێم مەترسن! ئێمە کە لێرەین زۆر خۆشحاڵین.

بەڕێوەبەری پۆلیس هاواری کرد: ئەدی ئەوانەی لە تەنیشت تۆن؟ هیچ کامێکیان مەترسیدار نین؟

جیمز وەڵامی دایەوە: ئاشکرایە کە مەترسیدار نین! ئەوانە باشترین بوونەوەری جیهانن! رێگەم پێبدەن تا یەك بە یەك پێتان بناسێنم و دواتر دڵنیام کە ئێوە بڕوام پێدەکەن.

دۆستان ئەی دۆستان، ئەو هەزارپێیەی کە لێرە دەیبینن ئەوندە میهرەبانە

هەر چەندە زۆر گەورە بووە بەڵام زۆر خوێن گەرم و قسە خۆشە

ژنی پاشایەك کە شای ئیسپانیایە بە هەزارپێی وتووە وەرە گاماس گاماس،

تا ئەو کاتەی کە پەرستارە جوانەکەی منداڵەکانی سەفەری کردوو- بە مۆڵەت یان بێ مۆڵەت-

با بێ و شازادەکان خۆشحاڵ بکا

بۆ شازادەکان ساز لێبدا

شتیان بۆ بچنێ، ئاوازیان بۆ بخوێنێ

جار بە جاریش گازێك لە میوەکان بدات.

( ئاگرکوژێنەوەیەك وتی: بەڵام کێشەیەکی بچووك هەیە، ئەویش ئەوەیە کە پاشای ئیسپانیا ئیتر شا نییە)

جیمز دەستی کرد بەشرۆڤە کردن و وتی:

کرمی خاکی ببینن چەندە درێژو جوانە

هەرچەند کار لەگەڵ کرمی خاکی ناخۆشە

بەڵام ئەو دەتوانێ بە باشی زەوی بکێڵێ

خاکی مردوو بە خێرایی نوێ بکاتەوە

کرمی خاکی دەتوانێ تونێل و مێترۆ و

جۆگەی ئاو هەڵکەنێ

(کرمی خاکی لە شەرمان سوور هەڵگەڕابوو و بە شانازیەوە قیت ڕاوەستا.

خانمی جاڵجاڵۆکە چەپڵەی لێدا و خۆشحاڵ بوو هاواری کرد: لەوە باشتر ناگوترێ.)



بەڵام کوللە، خوشکان برایان کوللە

لەبەر هۆکاری زۆر یەك نیعمەتە

نە ملیۆنێك و نە دوو ملیۆن هۆکار ئەوەندەی ئێوە داوام لێبکەن

دەبێ داوا لە کوللە بکەن

یەکسەر ئاوازێکتان بۆ لێبدات

وەك گەمەیەکی زۆر نوێ

دەتوانێ منداڵەکان بخافڵێنێ

و منیش لێرە پێتان دەڵێم لە هیچ دوکانێك

ناتوانن شتێکی وا باش بدۆزنەوە
هەر ئەوەندە بەسە دەست بە بەری پێیدا بێنن
ئیتر کوللە جوانەکەمان دەس دەکا بە بازدان و تەراتێن.
( بەڕێوەبەری پۆلیس بە سەرسامیەوە وتی: باوڕناکەم ئەوە زۆر درندە بێ!)
ئێستاش پێم خۆشە یەکسەر ئەو کرمە گوڵەئەستێرەتان پێی بناسێنم
گوڵەئەستێرە عاشقێکی سادەیە
زۆر بە ئاسانی بە سەقف یا دیواری ماڵەکانەوە دەنووسێ،
هەر چەند ئەو کارەی ئێوە کەمێك نائاساییە
بەڵام دڵنیا بن ئەوە نیشانەی زیرەکییە
چونکە لەمەودوا ئێوە
ئیتر پێویستی تان بە کارەبا بە گڵۆپ نییە
( نزیکەی پەنجاو دوو پۆلیس هاواریان کرد: ئەگەر ئەوە ڕاست بێت، ئەو بوونەوەرە ناو بانگێکی لەرادەبەردەر بەدەست دێنێ!)
هەروەها خانمی جاڵجاڵۆکەش لێرە ئامادەیە
کە یەك دنیای داوی ئامادە لە ناو سکی دا هەیە
پێویستە من لێرە ئاماژەی پێبدەم
خانمی جاڵجاڵۆکە خاتوو مافتی نەبینیوە

**و ئەگەر لە کاتی کەمین دانان لە ناو تۆڕەکەی دا**

**خاتوو مافتی ببینێ**

**بەڵێنتان پێدەدەم، نایترسێنێ**

**چونکە میهرەبانە**

**تەنیا هەندێك جار نیگاکانی جاڵجاڵۆکە**

**ئاگادارتان دەکاتەوە**

**ئەگەر وایە بۆ ئێوە هیچ زەحمەتێکی نییە**

**کە رۆژێ سەت جار ئەوە دووبارە بکەنەوە:**

**ئێمە نابێ جاڵجاڵۆکە بزۆزەکان بکوژین**

**ئێمە نابێ ئەوە لە یاد بکەین**

**کە دەبێ یارمەتیان بدەین، بانگهێشتیان بکەین بۆ داینگە بۆ گەمە کردن.**

**( هەموو پۆلیسەکان بە ئارامی سەریان بە نیشانەی رازی بوون جووڵاند و، تیمی ئاگرکوژێنەوەش بە ئەدەبەوە پێکەنین و هەندێك کەس هاواریان کرد: هورا!)**

**و ئەوەش خاڵخاڵۆکەی ئازیزم**

**میهرەبان و جوان و خاوێن**

**خاڵخاڵۆکە لەو سەفەرەدا هەمیشە نزیك و خۆشەویست و**

خەمرەوێنم بووە

خاڵخاڵۆکە نزیکەی چوارسەت بەچکەی بە نازی هەیە

هەموویانی لە ماڵێ بەجێ هێشتووە

بۆ خۆی لێرە میوانە

بەچکەکانی بە کۆخێکی تر دێن سەرتان دەدەن.

( پۆلیسەکان هاواریان کرد: ئەوە شادی هێنەرە! تیمی ئاگر کوژێنەوە، هەموویان دەستیان کرد بە سەما کردن و خەڵکەکەش هەموویان دەستیان کرد بە شادی کردن!)

جیمز بەردەوام بوو:

ئێستاش کرمی ئاوریشم

باشترین ئاوریشم لەو کرمە گەورەیە دروست دەبێ

ئاوریشمەکانی

هاوتای ئاوریشمی رۆمن

هاوتای ئاوریشمی فیلادلفیان

ئەگەر هەموو جیهان هەڵگێر و وەرگێڕ بکەن

بچن بۆ پاراگوئەو لە تیمباکتۆ سەر دەربێنن

مەحاڵە

ئاوریشمێکی واتان دەسکەوێ

تەنانەت لە سەنگاپوریش شتی وای لێ نییە
پێویستە لێرە وەبیرتان بێنمەوە
کە کرمی ئاوریشم ماوەیەك لەمەو پێش
خۆشبەختانە توانی جلێك بچنی و دواتر بیدووریّ و
شاژنی بەریتانیا بۆ بووکێنیەکەی لەبەری بکات،
لەمەو پێشیش ئێلەگێکی جوانی لە شێوەفیشەك
بۆ سەرۆك کۆماری ئێوە چنی.

( پۆلیسەکان هاواریان کرد: باشە، ئافەرین! و لەناکاو هاواریّکی توند لە دەوری ئیمپایرستی بەرزە بۆوە: وەرن خێرا بیان هێنینە خواریّ! چاوەڕوانی چین؟)

## سی و هەشت

پێنج خولەك دواتر هەموویان بە سەلامەتی هاتنە خوارەوە، جیمز بە خۆشحاڵیەوە چیرۆکەکەی بۆ گروپی گێژ و سەرسامی پۆلیس و کارمەندەکانی ئاگرکوژێنەوە گێڕایەوە. ئەوانەی لەسەر کۆخەکە هاتبوونە خواریّ، یەکسەر بوون بە پاڵەوان! تێکڕای خەڵکەکە تا لای قادرمەکانی هۆڵی شار یاوەریان بوو، تا ئەو شوێنەی کە بەرێوەبەری شارەوانی نیۆیۆرك وتاری بەخێر هاتنی پێشکەش کرد، کاتێك بەرێوەبەری شارەوانی وتارەکەی دەخوێندەوە، سەت

کرێکار لە کریکارانی بینا گەورەکان، بە گوریس و پەیژە و خولخولە، هێرشیان کردە سەر بینای ئیمپایرسیتی و کۆخە زەبەلاحەکەیان لەسەر نووکی ستونەکە بڵند کرد و هێنایانە خوارێ.

دواتر بەڕێوەبەری شارەوانی هاواری کرد: ئێستا پێویستە جەژنێك لەسەر شەقامەکە بۆ میوانە ئازیزەکانمان ڕێك بخەین!

و ئامادەکاری تەواویان بۆ ئەو مەراسیمە کرد، جیمز و تێکڕای دۆستەکانی سواری ئۆتۆمبیلێکی ئێسکۆرت بوون (کە یەك لیمۆزین[٢١] ی سەر بەتاڵی زۆر گەورە بوو).

دوای ئەوان نۆرەی کۆخە زەبەلاحەکە هات. پیاوەکان بە سلینگ و قولاپ بە خێرایی کۆخەکەیان بەرز کردەوەو لەسەر گەلابەیەکی زۆر گەورەیان دانا، کۆخەکە ئێستا، بە گەورەیی و شکۆو هەیبەتی هەمیشەیی خۆی لەسەر گەلابەکەیە. بەڵام هیچ کەس، بایەخی نە بەو کونە دەدا، کە ستونی بینای ئیمپایرسیتی لە بنکی کۆخەکە دروستی کردبوو، نە بەو ئاوەکۆخەی بەسەر شەقامەکەدا دەچۆڕایەوە.

---

٢١- لیمۆزین سەیارەیەکی تایبەت بە مەراسیمی گرنگە کە بەرزتر لە سەیارەی ئاساییە و شەش دەگای هەیە وهەموو شتێکی تێدایە.

لیمۆزینی بەڕێوەبەری شارەوانی لە پشت کۆخەکە، لە ئاوی کۆخەکەدا دەخزی کە لە هەموو شوێنێك ڕژا بوو، نزیکەی بیست لیمۆزینی تری کەسە ناودارەکانی شار، لە پشت لیمۆزینی بەڕێوەبەری شارەوانییەوە دەڕۆیشتن.

خەڵك لە ناوشەقامەکاندا بە ریز وەستابوون، لە خۆشیان دەیانقیژاند و لە پەنجەرەی تاوەرەکانەوە سەیری خوارەوەیان دەکرد، بە چەپڵە ڕێزانەوە وردە کاغەزی سپیان دەکردە شاباش، جیمز و دۆستەکانی کاتێك بە شەقامەکاندا تێدەپەڕین لە ئۆتۆمبێلەکانیاندا بە پێوە وەستابوون و دەستیان بۆ خەڵکی رادەوەشاند.

دواتر شتێکی سەیر ڕوویدا. مەراسیمەکە بە ئارامی تا جادەی پێنجەم بەردەوام بوو، کەچی لەناکاو کچێکی بچووك بە کراسێکی سوور لە ناو خەڵکەکە هاتە دەرێ و هاواری کرد: ئاخ، جیمز، جیمز! دەکرێ کەمێك لە کۆخە سەیرەکەت بخۆم؟

جیمز هاواری کرد: فەرموو! چەندت پێێ خۆشە بخۆ! خۆ ناکرێ بۆ هەمیشە هەڵیبگرین.

هێشتا قسەی جیمز تەواو نەببوو کە نزیکەی پەنجا منداڵی دیکە لە ناو خەڵکەکە هاتنە دەرێ و هوروژمیان بۆ سەر شەقامەکان برد.

منداڵەکان هاواریان کرد: دەتوانین ئێمەش کەمێك بخۆین؟

جیمز وەڵامی دایەوە: بێ گومان دەتوانن بخۆن! هەمووتان دەتوانن بخۆن!

منداڵەکان ڕایان کردە سەر گەلآبەکە و، وەك شارە مێروولە هێرشیان کردە سەر کۆخەکە و تێروپڕیان لێ خوارد. هەر کە هەواڵی ئەو ڕووداوە بلآوبۆوە، لە هەموو لایەکەوە کوڕو کچ بە هەلینگدان هاتن تا خۆیان بگەیەننە میوانداریەکە. زۆر خێرا بە درێژایی یەك کیلۆ مەتر منداڵ لە دوای کۆخەکەوە کە بە ئارامی لەشەقامی پێنجەمدا ڕێچکەیان بەست، بەراستی دیمەنێکی سەرسوڕهێنەر بوو. بەڕای هەندێك کەس، ئەوە شمشاڵ ژەنی هاملین[22] بوو لەناکاو هاتبوو بۆ نیۆیۆرك، بەڕای جیمز لە خەویشدا نەبینیوە و، باوەڕی نەدەکرد ئەو هەموو منداڵە لە جیهاندا هەبن، ئەوە دەگمەنترین شتە کە تا ئەو کاتە روویداوە.

لە کۆتایی دا، ئەو میوە زەبەلاحە هەمووی خورا، تەنیا دەنکە گەورە و قاوەیەکەی لەسەر گەلآبەکە بە جێ مابوو، کە بە لستنەوەی دەیان هەزار زمانی بچووك و بە تەماح، خاوێن کرابۆوە و دەدرەوشایەوە.

---

٢٢ -Pied Piper Of Hameli in شمشاڵ ژەنی ئەفسانەییە کە بە شمشاڵە جادویکەی خۆی، منداڵەکانی شاری هاملینی جادو کردو لەگەڵ خۆی بردن.

## سی و نۆ

و بەو شێوەیە سەفەرەکە تەواو بوو. بەڵام نەفەرەکان درێژەیان بە ژیان دا. هەمویان لەو وڵاتە نوێیەدا دەوڵەمەند و لە ژیانیاندا سەرکەوتوو بوون.

هەزارپێ بوو بە جێگری بەڕێوەبەری کۆمپانیایەکی بە ناوبانگی دروست کردنی پوتین و پێڵاو.

کرمی خاکی بە پێستە پەمەیی و جوانەکەی، لە کۆمپانیایەکی دروستکردنی کرێمی دەموچاوی خانمان دامەزرا تا لە تەلەفزیۆندا ڕێکلام بکات.

کرمی ئاوریشم و خانمی جاڵجاڵۆکە، دوای ئەوەی هەردووکیان فێر بوون لە جیاتی ئاوریشم، داوی نایلۆن بچنن، بەیەکەوە کارگەیەکیان دامەزراند تا گوریس بۆ ئەو کەسانە دروست بکەن کە لە سیرکدا لەسەری دەرۆن و یاری دەکەن.

گوڵەئەستێرەکەش جێگەی مەشخەڵی پەیکەری ئازادی گرتەوە و، بەم شێوەیە شار لە تێچووی پارەی کارەبا رزگاری بوو و هەموویان سپاسیان کرد.

کوللەی پیر بوو بە یەکێك لە ئەندامانی ئۆرکێستری سەمفۆنیای بیوبوراك و، ژەنینی مۆسیقایەکەی بوو بە جێگای ڕەزامەندی خەڵك.

خاڵخاڵۆکە کە هەموو تەمەنی بە ترس و لەرزەوە گوزەراندبوو، ماڵەکەی سوتابوو منداڵەکانیشی لە دەست دابوون، لەگەڵ بەڕێوەبەری گروپی ئاگرکوژێنەوە هاوسەرگیریان کرد و، بە خۆشی و شادی ژیانیان بردە سەر.

و بۆ ڕێز لێنان، دەنکە کۆخە زەبەلاحەکەیان بۆ هەمیشە لە پارکی ناوەندی دانا و، بوو بە پەیکەری یادگاریی. بەڵام ئەوە تەنیا پەیکەرێکی یادگاری نەبوو، بەڵکو خانوویەکی بە ناوبانگیش بوو، لە ناو ئەو خانووەدا، کەسێکی بە ناوبانگ دەژیا،

خودی جیمز هێنری تراتر

ئێوەش هەر ڕۆژێکی هەفتە بتانەوێ سەردانی ئەو شوێنە بکەن، ئەوندە بەسە لە دەرگا بدەن، دەرگا بە رووتاندا دەکرێتەوە و فەرمووی چوونە ژوەرەوە دەکرێن، ئەو ژووره بە ناوبانگەی جیمز کە بۆ یەکەم جار دۆستەکانی لەوێ بینی، هەندێك جار ئەگەر شانست هەبێ، ڕەنگە کوللەی پیریش لەوێ ببینی، کە لە ئارامیدا لەسەر کورسی یەك نزیك ئاگرەکە پشوو دەدات، یا دوور نییە خاڵخاڵۆکەش هاتبێ تا سەر لە جیمز بدات و چایەکیش بەیەکەوە بخۆنەوە و قسەی خۆش بکەن، یا هەزارپێ لەوێ بێ تا نموونەیەکی نوێ لە پوتینە باش و تایبەتەکانی، نیشانی جیمز بدات.

هەر رۆژێکی هەفتە، سەدان و سەدان منداڵ لە دوور و نزیکەوە هوروژم دێنن بۆ شار، تا دەنکە کۆخی سەرسورهێنەر لە پارکەکەدا ببینن. جیمز هێنری تراتر کە سەردەمێك ئەگەر لە یادتان بێ، خەمبارترین و تەنیاترین مێرمنداڵ بوو ، ئێستا هەموو منداڵ و مێرمنداڵانی دنیا دۆست و هاوڕێی ئەون. زۆربەیان بەردەوام داوایان لێ دەکرد، دوبارە و دوبارە چیرۆکی سەفەری کۆخەکەیان بۆ بگێڕێتەوە، جیمز بیری کردەوە زۆر باش دەبێ ئەگەر رۆژێك دابنیشێت و ئەو چیرۆکە بکا بە کتێبێك.

ئەو کارەشی کرد.

ئەوەش هەمان ئەو کتێبەیە کە ئێوە هەر ئێستا کۆتاییتان بە خوێندنەوەی هێنا.

جیمز لەو کاتەی کە دایك و باوکی لە لایەن کەرگەدەنێکی تووڕەی هەڵاتوو لە دەرەوەی باغچەی ئاژەڵان خوران، ناچار بوو لەگەڵ دوو پورە دڵرەقەکەی دا بژی. ڕۆژگارێکی زۆر سەختی هەبوو تا ئەو کاتەی ڕۆژێك شتێکی زۆر سەیر روویدا و جیمزی لەو ژیانە ناخۆش و ماڵوێرانکەرە رزگار کردو ناردی بۆ سەفەرێکی بڕوا پێی نەکراو.




خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

MUKIRYANI HOUSE FOR PRINTING & PUBLISHING

www.mukiryani.com

2014





بایی (٣٠٠٠) دینار